عەلی باپیر




# کێ شایستەی مینبەر و میحرابە؟

2020 - 1441





**کێ شایستەی مینبەر و میحڕابە**
**نووسینی: عــــەلــی بــاپیر**


چاپی یەکەم ١٤٤١ز - ٢٠٢٠ك



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
عەلی بــــاپیر (نووسەر)
کێ شایستەی مینبەر و میحڕابە
١٥١ لاپــەڕە
١٤ * ٢١ سـم
بابـەت : ئایینی
ISBN : 978-9922-632-23-0

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٤١٧ ) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

**خــەتی بــەرگ** : نــــەوزاد کۆیــی
**دیزاینی ناوەوە** : زەردەشت کاوانی

﴿ يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴾

المجادلة -١١-



# پێشکەش بێ

بە هەرکەسێك کە وەك لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەوەشێتەوە، لەسەر مینبەرەکەی دەدوێ و لە میحرابەکەیدا دەوەستێ و، بە هەموو توانایەوە تێدەکۆشێ: هەرچی زیاتر- لە هەموو ڕوویێکەوە- بەو زاتە پاك و چاکە بچێ و بە شوێنپێی ویدا هەنگاو بنێ .



# پێشەکی و ڕێخۆشکردن

إنَّ الْحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَن يَهْده اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾آل عمران.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾النساء.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾الأحزاب.

أَمَّا بَعْـــــدُ:

فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيثِ كَلاَمُ الله، وَخَيْرَ الْهَدِي هَدْيُ مُحَمَّد صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار.



**خوێنەرە بەڕێز و خۆشەویستەکانم!**

ئەم کتێبەی بەردەستتان - وەك لە ناوونیشانەکەدا دیارە - لە بارەی زانا و پێشەوایانی ئیسلامەوەیە، بە تایبەت ئەوانەی خاوەنی مینبەر و میحڕابن ، واتە بۆ وتار دان لەسەر مینبەر دەوەستن و، لە میحڕابیشدا پێشنوێژیی (إمامة) بۆ مسوڵمانان دەکەن، کە ئەو دووانە: وتاربێژیی و پێشنوێژیی (الخطابة والإمامة) دوو ئەرك و کاری گەورە و گرنگی پێغەمبەری کۆتایی (محمد ﷺ) بوون و، وەك سەجەم ئەرك و کارەکانی دیکەی، تاکو کۆتایی تەمەنی پڕ بەرەکەتی لەسەریان بەردەوام بووە:

شایانی باسیشە : بەندە لە دەوری (٢٠) ساڵ لە مەوبەردەوە، کتێبێکم بە ناوی: (زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن؟!) لە بارەی زانا و شارەزایانی میراتگر و جێگری پێغەمبەردوە ﷺ نووسیوە و، هەتا ئێستا سێ جاران چاپ کراوەتەوە و، تەرجەمەی عەرەبییەکەیشی چاپی سێیەمیشی کراوەتەوە و، لە چاپی سێیەمی دا ناوونیشانەکەیمان گۆڕیوە بۆ:

(علماء الإسلام: خصالهم النبيلة، وظائفهم الثقيلة، مواقفهم الجليلة)

ئنجا لەو کتێبەدا کە دەوری (٤٠٠) لاپەڕەیە زۆر بە وردیی باسی (زانایانی ئیسلام و پێشەوایانی مسوڵمانانم کردووە) و پێم وایە تا ڕاددەیەکی باش نوختەم خستۆتە سەرپیت، بۆیە پێویستە هەرکەس بیەوێ بەدرێژیی لەو بارەوە ئەوەی پێویستە ببیستێ و بیزانێ، بگەڕێتەوە بۆ ئەو کتێبە.

ئەم کتێبەش بریتییە لە کۆی دوو وتار بە ناوونیشانەکانی:

## کێ شایستەی مینبەر و میحڕابە؟
## چۆن شایستەی مینبەر و میحڕاب دەبین؟

کە لە دوو کۆڕدا کە بۆ بەندە بەسترابوون [١]، دراون و، پاش دەست پێداهێنانێکی کەم[٢]، بەمجۆرەیان لێهاتوە، پێم وایەکۆمەڵێك ڕێنمایی و هۆشداریی گرنگ و پێویستیان گرتوونەخۆیان، لە ڕووی ئەرك و کاری مامۆستایان ئەهلی مینبەر و میحڕاب و، چۆنیەتی بیرکردنەوە و تێڕوانین و هەڵسوکەوت و هەڵوێستیانەوە، لە زۆر بواران دا، تاکو هەرچی زیاتر شایستەیی ئەوە پەیدابکەن، کە بەجێگر و میراتگری بەشێك لە ئەرك و کارەکانی پێغەمبەری خاتەم (محمد ﷺ) دابنرێن، کە بریتیە لە، وتاردان لەسەر مینبەرەکەی و پێشنوێژیی کردن لە میحڕابەکەیدا.

ئنجا هەرچەندە ناو و نیشانی وتارەکان و کتێبەکەش پەیوەستە بە توێژێکی تایبەتەوە، بەڵام وێڕای ئەوان سەجەم مشوورخۆرانی کار و چالاکیی مسوڵمانێتی و دینداریش دەگرێتەوە، لە هەر پێگەیەك و لە هەر پۆشاکێك دابن و، هەر ناو و نیشانێکیان هەبێ، بەڵکو پەیوەستە بە تێکڕایی مسوڵمانانیشەوە، چونکە پێویستە مسوڵمانانیش بزانن: ئەوانەی دەبنە میراتگر و جێگرانی پێغەمبەر و پێشەواو چاوساغیان، دەبێ چۆن بن!

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك

---

(١) یەکەمیان لە شارۆچکەی (خەلیفان) لە شەوی: (٢٠١٩/٩/٢٠ز) دا، دووەمیشیان لە شاری (هەولێر) لە شەوی: (١٤٤١/٦/٢ك) بەرامبەر بە (٢٠١٩/١١/١٣ز).

(٢) لەلایەن دووبرای دڵسۆزەوە نووسرابوونەوەو تایپ کرابوون، خوا پاداشتیان بداتەوە و زۆر سوپاسیان دەکەم.

www.alibapir.com

وتاری یەكەم

شارۆچكەی خەلیفان
٢٠ / ٩ / ٢٠١٩

# كێ شایستەی مینبەر و میحرابە؟







https://youtu.be/m7lVEhmu5FA







## پێشدەستیی

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله، محمد وآله المهتدين بهداه، من الصَّحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسانٍ إلى يوم اللقاء.

بەڕێـزان!

هەموو لایەك بەخێربێن زۆر خۆشحاڵم بەدیدارتان، بەتایبەت مامۆستایانی بەڕێز! ئێمە ئەم کۆڕو مەجلیسەمان زیاتر بۆ مامۆستایانی ئەهلی مینبەر و میحڕابی بەڕێز، ساز کردوە، خۆشحاڵم کە ئەمشەو بەدیداری ژمارەیەکی زۆر لە مامۆستایانی دەڤەری خەلیفان و دەوروبەری شاد دەبم، هەروەها لەگەڵیشیان دا ژمارەیەك لە ڕیش سپییان و، چین و توێژەکانی دیکەو، ژمارەیەك لە خوشکانی بەڕێزیشمان، خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتی هەموو لایەکمان بدات، هەرچی زیاتر بەندایەتیی خۆمان بۆخوا قووڵتر بکەینەوەو ساغتر و چاکتری بکەین.

بەڕێزان! ئەو بابەتەی ئامادەم کردوە، لەژێر ناوونیشانی: {کێ شایستەی مینبەر و میحڕابە؟}دایە.



مامۆستایانی بەڕێز! گومانی تێدا نیە کە پێغەمبەری خاتەم {محمد} (صلی الله علیه وسلم)، ئەوەی کە بۆ ئێمەی بە میرات بەجێهێشتوە، بریتیە: لەو وەحییەی خوای پەروەردگار کە لە قورئاندا، پاشان لە ڕێباز و ڕێوشوێنەکەی خۆیدا بەرجەستەیە. ئنجا ئایا ئەوانە کێن، کە ناوی میراتگرێتیی وجێگرایەتیی پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) لەسەرە؟ هەڵبەتە بەپلەی یەکەم، ئەوانەن کە لەسەر مینبەرەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەوەستن و لە میحرابەکەیدا پێشنوێژیی و ئیمامەت بۆ خەڵکی دەکەن. بۆیە بەپێویستی دەزانم، کە لەم کۆڕو مەجلیسەماندا بەو پرسیارە دەست پێبکەم: کێ شایستەی مینبەر و میحرابە!؟ بەواتایەکی دیکە: کێ جێگر و میراتگری پێغەمبەرانە (علیهم الصلاه والسلام)!؟ وەڵامی ئەو پرسیارەش لە چوار تەوەردا دەخەینە ڕوو:

**تەوەری یەکەم:** تێیدا پلەو پێگەی ئەهلی میحراب دەخەینە ڕوو، کەسانێك کە دەچنە سەر مینبەری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەو شوێنە بەرزەوە، بەرزیی هەم بە واتا ماددییەکەی، هەم بە واتا مەعنەوییەکەی، لەو شوێنە بەرزەوە، ڕوو دەکەنە مسوڵمانان و دەیاندوێنن و پەیامی خوایان پێ ڕادەگەیەنن و، لە میحرابی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)دا ڕادەوەستن و پێشنوێژیی بۆ مسوڵمانان دەکەن، ئەوانە چ پلەو پێگەیەکیان هەیە!؟

**تەوەری دووەم:** تێیدا خەسڵەتە پێویستەکانی ئەهلی مینبەر و میحراب باس دەکەین، کەسانێك کە ئەهلی مینبەر و میحراب بن، دەبێ ڕازاوە بن بە چ جۆرە خەسڵەت و سیفەتێك، تاکو شایستەی ئەوە

بن کە بچنە سەر مینبەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و، لە میحراڕبی پێغەمبەردا بۆ نوێژکردن پێش خەڵك بکەون؟

**تەوەری سێیەم:** تێیدا چەند هەڵە و پەڵە و، کەم و کوڕییەك، کە دەبێ ئەهلی مینبەر و میحراڕب، خۆیانیان لێ بپارێزن، دەخەینە ڕوو.

**تەوەری چوارەم:** تێیدا چارەسەری ئەو کەم و کوڕیی و لادان و خلیسکانانە کە ئەهلی مینبەر و میحراڕب گیرۆدەیان دەبن: دەخەینەڕوو.

لەکۆتاییشدا، ڕوودەکەمە خەڵك و جەماوەری مسوڵمانی خۆمان، کە دەبێ ئەوانیش لەگەڵ ئەهلی مینبەر و میحراڕبدا لەگەڵ مامۆستایان و میراتگرو جێگرانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)دا، چۆن مامەڵە بکەن؟.

مامۆستایانی بەڕێز!

من نەهاتووم هەموو یان زۆرێك لەو ئایەت و فەرمایشتانەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کە زۆر زۆرن لەبارەی زانایان و جێنشینانی پێغەمبەرانەوە (عليهم الصلاة والسلام) بخەینەڕوو، بەڵکو ئاماژەیەکی کورت دەکەم بە سێ ئایەت لە قورئاندا:

**یەکەم:** ئایەتی ژمارە (٣٢) لە سوورەتی (فاطر)دا، کە خوا دەفەرموێ:

﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَـٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ﴾.

واتە: پاشان کتێبی خۆمان کردە میراتی ئەو بەندانەمان کە هەڵمان بژاردوون.

کەواتە: هەرکەسێك کەم و زۆر ئەهلی قورئان بێ، شارەزا بێ لەدینی خوادا، ئەوە بەئەندازەی ئەوە کە ئەهلی قورئانەو کارلێك (تفاعل) لەگەڵ قورئان دا دەکات و، پابەندە بە ڕێبازی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، وەبەر ئەو موژدەیە دەکەوێ، کە خوا هەڵیبژاردوە، یەکەم بەندەی خوایە نەك بەندەی کەس وشتی دیکەو، پاشان هەڵیبژێردراویشە لەلایەن خواوە، کە ئەوانیش خوای کارزان و پەروەردگار پۆلێنیان دەکات و دەفەرموێ:

﴿فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٢﴾﴾ (فاطر:٣٢).





یانی: ئنجا هەیانە: ستەمی لەخۆی کردوە، هەیانە میانجییەو، هەشیانە لەچاکان دا پێش کەوتۆتەوە بەمۆڵەتی خوا، ئا ئەوەیە بەخششی گەورە.

ئنجا ئەوەی من لێرەدا زۆرم مەبەستە و بەبەڵگەی دەهێنمەوە، ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: کتێبی خۆمان بەخشی بەو بەندانەمان کە هەڵمانبژاردوون، ئەوە پێگەیەکی زۆر گەورەیە، خوا کەسانێك هەڵبژێرێ تاکو لە کتێب و وەحیی و بەرنامەکی خۆیدا شارەزایان بکات، بەڵێ بەدڵنیایی ئەوە پێگەیەکی زۆر گەورەیەو، پلەیەکە بەهەموو کەسێك نادرێ، بۆیە هەرکەسێك خۆی لەسەر مینبەری پێغەمبەر بینییەوە، خۆی لە میحرابی پێغەمبەردا بینییەوە، خۆی بەئەهلی قورئان زانی، دەبێ زۆر دڵی بەخۆی خۆشبێ، بەڵام لەهەمان کاتیشدا، دەبێ زۆر لەخۆی وریابێ، مرۆڤ هەتا شوێنی بەرزتربێ، ئەگەر بکەوێتە خوار زیاتر ئەزیەتی پێ دەگاو، مرۆڤ هەتا شوێنی بەرزتربێ، خەڵك زیاتری دەبینێ و، ئەوکەسەی شوێنی بەرزتربێ هەموو بایەك دەیگرێتەوە، بۆیە دەبێ زۆر لەخۆی وریا بێ.

**دووەم:** ئایەت کە ئاماژەی پێ دەکەم، ئایەتی ژمارە (١٨)یە لە سورەتی (آل عمران):

﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِ ﴾ (آل عمران: ١٨)

واتە: خوا شایەدیدا، کە جگە لەو پەرستراوێکی دیکە نیە، (پەرستراوێکی دیکەی شایانی پەرستران)، هەروەها فریشتەکانیش شایەتییانداو، ئەهلی زانستیش، (ئەوانەی کە خاوەنی زانیاریین) خوا دادگەریی بەرێوە دەبات.

ئەوەش دیسان شتێکی زۆر گەورەیە، خوا «سبحانه وتعالی» دوای شایەدیی دانی خۆی، لەسەر وەحدانییەتی خۆی، باسی شایەدیی دانی فریشتان دەکات و، لەدوای ئەوان یەکسەر باسی شایەدییدانی ئەهلی عیلم و زانایان دەکات.

**سێیەم:** ئایەت کە لێرەدا وەك نموونە دەیهێنینەوە، ئایەتی ژمارە (١١)ی سوورەتی (المجادلة)یە:

﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ﴾، (المجادلة: ١١)

واتە: خوا ئەوانەتان کە ئیمانیان هێناوە بەرزیان دەکاتەوە، (مرۆڤ بەهۆی ئیمانەوە بەرز دەبێتەوە، هەرکەسێك ئیمانی هێنا، لەلای خوا بەرز دەبێتەوە) و ئەوانەی زانیارییان پێدراوە چەندان پلە بەرزیان دەکاتەوە، واتە: پلەکانیان بەرزترن لەهی بڕواداران بەگشتیی، بەڵام بێگومان دەبێ وردببینەوە: ئەو زانایانە کامەنەن، کە لە بڕواداران پلەیان بەرزترە؟ وەنەبێ هەرکەسێك شارەزابوو بەبێ هیچ مەرجێکی دیکە، یەکسەر لەلای خوا بەرز ببێتەوە، نەخێر ئەوەش مەرجی خۆی هەیە، کەواتە وەك گوتم: پێویست ناکات زۆر ئایەت و فەرمایشتان بێنم، هەر ئەو سێ ئایەتە موبارەکە بەسن، بۆ ئەوەی بزانین پێگەو پلە و پایەی ئەوانەی کە بەمیراتگری پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و بە جێنشینیی پێغەمبەران دادەنرێن و، دەچنە سەر مینبەرەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و لە میحرابەکەیدا دەوەستن، چ پلەوپایەکی بەرز و چ پێگەیەکی مەزنیان هەیە!

بەڕێــزان!

لێرەدا تەعبیری (ئەهلی مینبەر و میحڕاب)م بەکارهێناوە، بۆیەش ئەو تەعبیرەم بەکارهێناوە، چونکە، خۆتان دەزانن کە لە ئیسلامدا مەدحی زانایان (علماء) کراوە، خوا نەیفەرمووە شێخ و، مەلاو، مامۆستا، بەڵکو فەرموویەتی: زانا (عالم)، ئەوانەی زانیارییان پێدراوە {الذين أوتوا العلم}، ئنجا مەرج نیە تەنیا ئەوانەی کە لە پۆشاکێکی تایبەتدان، یان تەنیا ئەوانەی دەچنە سەر مینبەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، یان ئەوانەی لە میحڕابەکەی دا دەوەستن[1]، مەرج نیە تەنیا ئەوان زانا بن، بۆوێنە: هاوەڵانی پێغەمبەر خوا لێیان ڕازی بێ، هەموویان خاوەنی مینبەر و میحڕاب نەبوون، لەدوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چوار کەس بەپلەی یەکەم خاوەنی مینبەر و میحڕاب بوون (ئەبوو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی)، «خوا لێیان ڕازی بێ» کە حوکمڕانی مسوڵمانان بوون، ئەوکات وەك ئێستا دین و دەوڵەت لەیەك جیا نەکرابوونەوە، عیبادەت و سیاسەت بەگژ یەکدا نەکرابوون، بەڵکو حوکمڕانی مسوڵمانان پێشنوێژیی بۆ مسوڵمان دەکردو، وتاریشی بۆ دەدان، واتە: پێشنوێژو وتاربێژیان بوون و، لەهەمان کات دا سەرۆکیشیان بوون، ئەوەش حاڵەتی ئاسایی مسوڵمانانە، دەبێ کەسێك سەرۆك و بەرپرسی مسوڵمانان بێ، کە لەسەر مینبەرەکەی

---

(١) مەبەستم ئەوەیە کە بۆیە گوتوومە: (ئەهلی مینبەر ومیحڕاب) تاکو سەرجەم ئەوانەی شایستەیی جێگرێتیی ومیراتگرێتیی پێغەمبەریان هەیە و، شایستەن بچنەسەر مینبەرەکەی و لەمیحڕابەکەی دا بوەستن، بیانگرێتەوە، با بەکردەوەش لەسەر مینبەر و لەمیحڕاب دا نەبن.





پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)ەوە، لەوێوە ئاڕاستەیان بکات، ئایەتی خوایان بۆ بخوێنێتەوە، فەرمایشتی پێغەمبەریان بۆ بخوێنێتەوە، دەبێ لە میحڕابەکەی پێغەمبەریشدا پێش نوێژییان بۆ بکات، بەڵام بابایەکی نوێژنەکەری چاو نەشۆر، ئەگەر خەڵك وشیار و وریابێ، ڕازی نابن بابایەك پێشیان بکەوێ، کاروباری دنیایان بۆ بسووڕێنێ، کە بڕوای بە بەرنامەی خوا نیەو پێوەی پابەند نیە، کار وباری دنیای مسوڵمانان، دەبێ بەهەوێنی قورئان و سوننەت و بەهەوێنی وەحیی و شەریعەتی خواوە هەڵسووڕێنرێت، ئەگەرنا ئەو حوکمڕانە، ڕەوایەتیی (شرعية)ی نیە، بەڵام چ لە وەزعی مسوڵمانان دەکەی کە بەو شێوەیەیان لێهاتوە کە دەیبینین!!.

ئنجا با بزانین خەسڵەتە پێویستەکانی ئەهلی مینبەر و میحڕاب چی و چین؟

**١- بوونناسیی و تێڕوانینێکی ڕاست و ڕوون:**

مامۆستایانی بەڕێزو خۆشەویست! بەر لەهەموو شتێك دەبێ ئەهلی مینبەر و میحڕاب، خاوەنی تێڕوانین و بوونناسییەکەی ڕاست و دروست بن، پێویستە پێش هەموو شتێك خۆیان بناسن و خوا بناسن، ئەم بوون (وجود) و گەردوونە بناسن، پێش ئەوەی بێینە سەر باسی ئیمان و عەقیدە، کەسێك بەکەڵکی ئەوە دێت پێشەوایەتیی خەڵك بکات و بچێتە سەر مینبەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و لە میحڕابەکەیدا بوەستێت، کە بوونناسییەکی ڕاست و دروستی هەبێ،

بزانێت کە ئەم گەردوونە شاری بێ خاوەن نیەو، مرۆڤ و بوونەوەر بۆچی درووستکراون؟! ئامانج و حیکمەت لێیان چییە؟ لەکوێوە هاتوون؟ بۆچی هاتوون؟ بۆکوێ دەچن؟! کۆی ئەو پرسیارە گرنگانە بەدرێژایی مێژوو، فەلسەفە خەریکی وەڵامدانەوەی ئەوانە بووە، کە ئینسان بزانێ: ئەو وجوودە چییە، خاوەنەکەی کێیەو، مرۆڤ چییەو، بۆچی هاتوە؟ کێ هێناویەتی؟ لەکوێوە هاتوە؟ بۆ کوێ دەچێ؟ دەبێ چی بکات و، چۆن بکات؟ ئنجا وەڵامی ئەو پرسیارانە هەموویان خوا (سبحانە وتعالی) لە قورئاندا زۆر بە ڕوونیی خستوویەتە بەردەستی ئێمە، بۆ نموونە: لە ئایەتی ژمارە (٧)ی سوورەتی (هود)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا... ﴾.

واتە: خوا ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژاندا (واتە: بە شەش قۆناغ) هێناونەدی و ئەوکاتە عەرشی خوا لەسەر ئاو بوو، تاکو تاقیتان بکاتەوە: کامەتان کردەوەی چاکترە؟

کەواتە: ئەم گەردوونە هەمووی بەسەر و خواریەوە، بۆ ئەوە دروستکراوە تاکو ئێمەی تێدا تاقی بکرێینەوە.





**٢- ئیمانێکی پتەوو دامەزراو:**

ئنجا دوای ئەوە دەبێ ئەهلی مینبەر و میحڕاب، خاوەنی ئیمانێکی پتەو و دامەزراوبن، ئیمان بەخوا، بەفریشتەکانی خوا، بەرۆژی دوایی، بەکتێبەکانی خوا، بەپێغەمبەرانی خواو، بەنەخشە و ئەندازەگیریی خوا بۆ گەردوون، ئیمانێك کە هەر چوار پێکهاتە بنەڕەتییەکەی هەبن:

١- زانینی عەقڵ. ٢- پەسندکردنی دڵ. ٣- دانپێدا هێنانی زمان. ٤- کردەوەی ئەندامەکان.

**٣- خواپەرستییەکی ساغ و بێ خلّتە:**

ئنجا دەبێ ئەهلی مینبەر و میحڕاب خاوەنی عیبادەتێکی ساغ و بێ خلّتەبن، دوور لە بیدعەت و، دوور لە لادان و هەڵەو پەڵە و داهێنان (إحْداث) لەدین دا.

**٤- تەقوایەکی تەواوو تەزکیەکی ڕیشە داکوتراو:**

ئنجا دەبێ جێگرانی پێغەمبەری خوا خاوەنی تەقوا و تەزکیەی نەفس بن، نەفسێکی خاوێن و پاکیان هەبێ.

**٥- ئەدەب و ڕەوشتێکی ڕەندو پەسند:**

هەروەها ئەهلی مینبەر و میحڕاب دەبێ ڕەوشتێکی بەرز و جوانیان هەبێ و، ئاکارێکی پەسەندیان هەبێ و، هەڵوێستێکی جوامێرانە و مەردانەیان هەبێ، لەهەموو کایەکانی ژیانیاندا.

### ٦- زانیاریی بەدین وئاشنایی بەژین:

پاشان ئەهلی مینبەر و میحراب پێویستە زانیارییەکی قووڵ و فراوانیان هەبێ بە دین و، شارەزایی و بەرچاو ڕوونییەکی چاکیان هەبێ بە ژین، پێویستە هەم لە دین دا زانا بن، هەم بەژینیش ئاشنابن، ئەگەر تەماشای زانایانی پێشینمان بکەین، پێشەوایەکانمان (ڕەزا و ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) وەك چۆن شارەزای وەحیی خوا بوون، ئاواش ئاگادارو ئاشنای واقیعی خەڵك وکۆمەڵگا بوون، بۆ وێنە: ئەبو حامیدی غەززالیی نامیلکەیەکی هەیە بەناوی: (الكشفُ والتبيين عن غرور خلق الله أجمعين)[1]، نامیلکەیەکی گچکەیە، بەڵام هەموو توێژەکانی کۆمەڵگا باس دەکات: ئایا شەرعزانان نوقتە زوعفیان چییە؟ ئنجا بازرگانەکان؟ ئنجا ئەهلی کەسابەت؟ ئنجا دەوڵەمەندەکان؟ دوایی نەدارەکان؟ دوایی کرێکارەکان؟ هتد...

بەڵێ زانا چۆن بە دین شارەزایە، دەبێ ئاواش بە ژین ئاشنا بێت، هەندێك لە مامۆستایان کە شارەزای خەڵك و کۆمەڵگا نین، بە ئاسانیی فێڵیان لێدەکرێ و لە خشتە دەبرێن و، کڵاویان لەسەر دەنرێ، بۆ مەبەستێکی ناشەرعیی و پێچەوانەی بەرنامەکەی خۆیان، بەکاردەهێنرێن و بەخۆشیان نازانن! بۆیە زانا دەبێ بەخەڵك ئاشنا بێت، دەبێ خێر و شەڕی کۆمەڵگا لێك بکاتەوە، زانایان و پێشەوایانی پێشینی ئێمە، زۆر شارەزای تەوژمە سیاسیی و فیکرییەکانی خۆیان

---

(١) واتە: (پەردە لەسەر لادان وخستنەڕووی بوغرابوونی تێکڕای خەڵکی خوا) کە مەبەستی هەڵەو پەڵەو لادانی توێژەکانی کۆمەڵگای خۆیەتی.

بوون، پێشەوایەکی وەك (إبن تیمیة) تەماشادەکەی، زانایەکی وەك (إبن القیم) تەماشادەکەی، زانایەکی دیکەی وەك (الشاطبي) تەماشادەکەی، پێشەوایەکی وەك (شێخ عبدالقادری گەیلانیی)...هتد هەموویان زۆر شارەزای حاڵ و باڵی خەڵك بوون، نەك لە بورجێکی عاجییدابن و، تەنیا لە کتێبەکانی خۆیان دا شارەزا بن! بەڵکو شارەزای واقیعی کۆمەڵگاش بوون.

**٧- ناخی پاك و دڵ و دەروونی ڕووناك:**

خەسڵەتێکی دیکەی زۆر پێویست بۆ ئەهلی مینبەر و میحراب، ئەوەیە کە ناخێکی پاك و دڵ و دەروونێکی ڕووناکیان هەبێت، مامۆستایان! هەرچی هەڵە و پەڵەی مرۆڤ کە تووشی دێت، چ ئەهلی مینبەر و میحراب، چ خەڵك بەگشتیی: سیاسەتمەدار، کاسب، بازرگان، گەنج، پیر، پیاو، ئافرەت، هەرچی غەڵەت و پەڵەتی ڕواڵەتیی هەیە، کە مرڤ تووشی دێت، ڕەگ و ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ناخی، بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿وَذَرُواْ ظَٰهِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَبَاطِنَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡسِبُونَ ٱلۡإِثۡمَ سَيُجۡزَوۡنَ بِمَا كَانُواْ يَقۡتَرِفُونَ ﴿١٢٠﴾﴾ الأنعام ١٢٠.

واتە: گوناحی ئاشکرا و گوناحی پەنهانیش واز لێبێنن.... هەرچی گوناحی ئاشکرایە، هەرچی گوناحی ئەندامەکانە، هەمووی پەیوەندیی بەدڵ و دەروونەوە هەیە، بۆ نموونە: مرۆڤ کەی غەیبەتی کەسێك دەکات؟ کاتێك کە لە دڵەوە ڕقی لێی بێت.

هەروەها کەی مرۆڤ خۆی بەزل زانیی و کەشخە و فیزی پەیدا دەبێ؟ کاتێك کە لە دەروونەوە خۆی لەلا گەورە و پەسەند بێ.

دیسان کەی مرۆڤ دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ترس و تەماح؟ بێگومان کاتێك کە لە دەروونەوە بێ هێزبێ و پشتی بەخوا قایم نەبێ و، دڵی بەخواوە پەیوەست نەبێ.

هەروەها کەی مرۆڤ بەهۆی تەماع وەبەرنران و هەڕەشە لێکرانەوە بەچۆك دانایەت؟ بەدڵنیایی کاتێك کە لە دەروونەوە بە هێزبێ و دڵی بەخواوە پەیوەست بێ، بۆیە ناخی پاك و ڕەوشتی چاك و دڵ و دەروونی ڕووناك، بناغەی دامەزراویی و نەلەخشاویی مرۆڤەو، هەتا مرۆڤ لە دەروونەوە پاك و ڕووناك نەبێ، بەتەئکید ڕواڵەتی ڕازاوەو چاك نابێت.

**٨- مەبدەئیی بوون:**

سیفەتێکی دیکەی زۆر پێویست بۆ ئەهلی مینبەر و میحڕاب، بریتیە لە مەبدەئیی بوون و خۆڕاگربوون، لەسەر بەرنامەی خوا، جێگرانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەو بنەما و مەبدەئانەی کە لەپەیامی خوا وەری گرتوون، بەهیچ شتێکیان ناگۆڕێتەوە، ئنجا خوای زاناه توانا کە دەفەرموێ:

﴿وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ المائدة-٤٤-.

واتە: نرخێکی کەم بە ئایەتەکانم مەکڕن، ئنجا ئایا ئەگەر کەسێك بە نرخێکی زۆر ئایەتەکانی خوا بفرۆشێ و نرخێکی زۆریان پێ بکڕێ،




دەبێ ڕەوابێ؟! بەتەئکید نەخێر، ئەدی مەبەست چییە؟ یانی: ئەگەر هەمووو دنیاشت بدەنێ بەرانبەر بە ئایەتەکانی خوا، تۆ هەر شتێکی کەمت بە ئایەتەکان کڕیوە، شتێکی گرانبەهات داوە، شتێکی بێ قیمەتت کڕیوە، ئەگەر هەمووو دنیاش بێ، مەبەست ئەوەیە، مەبەست ئەوە نیە کە ئەگەر نرخێکی زۆر وەربگری لەبەرانبەر ئایەتەکانی خوادا، قەیدێ نەکات، بەڵام ئاگات لێ بێ، هەرزان فرۆشیان نەکەی! نەخێر ئەگەر هەمووو دنیاشت بدەنێ، هەر نرخێکی کەمە.

ئنجا بەتایبەتی ئەهلی عیلم و مینبەر و میحڕاب، ئەو مەبدەئانە هی خۆیان نین و، هی حیزبێکی شەیتانیی نین و، هی حیزبێکی عەلمانیی نین، بەڵکو هی وەحیی خوان، بۆیە کەس بۆی نیە سەودا و مامەڵە و بازرگانییان پێوە بکات، من زۆر پێم حەیفە، حیزبێك کە بەرنامەکەی غەیری قورئان و سوننەت بێ، تەماع لە مەلایەك بکات، زۆر حەیفە مەلایەك کە لەسەر مینبەرو میحڕابەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەوەستێ، حیزبێك کە بڕوای بە قورئان و سوننەت و، مینبەر و میحڕاب و، بەو کەسەش نیە کە مینبەر و میحڕابی داناون، کە پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) تەماعی تێبکات و بیکڕێ، زۆر حەیفە هەر خودی تەماع تێکرانەکەی حەیفە، چ جای کڕران و فرۆشرانەکەی، هەرئەوە کە تەماعت تێبکەن، زۆر حەیف و عەیبە!

**٩- ئەمیندار بوون لەسەر ئیسلام:**

خەسڵەتێکی دیکە کە بۆ ئەهلی مینبەر و میحراب پێویستە، ئەوەیە کە ئەمینداربن لەسەر ئیسلام، تەماشا بکەن! لەسوورەتی (الأعراف)دا (هود) علیه السلام بەگەلەکەی (عاد) دەفەرموێ:

﴿ وَأَنَا لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴾.

واتە: من بۆ ئێوە دڵسۆزێکی ئەمیندارم، یانی: ئێمەی پێغەمبەران: دڵسۆزین و بە پەرۆشین بەخەمتانەوەین، خێر و قازانجی ئێوەمان دەوێ، هەروەها ئەمینین لەسەر ئەم دین و پەیامەی خوا، نایگۆڕین و، لێی کەم و زیاد ناکەین، وەك خۆی دەیخەینە ڕوو، بەڕاستیی ئەمینداربوون لەسەر پەیامی خوا، زۆر خەسڵەتێکی گرنگە، کە پێویستە لە ئەهلی مینبەر و میحڕابدا هەبێ.

**١٠- خۆڕاگریی و کول نەبوون و شل نەبوون:**

ئەمیش خەسڵەتێکی دیکە گەورەو گرنگ وپێویستە بۆ ئەهلی مینبەرو میحراب، کە دەیانەوێ لەڕێی پێغەمبەرانەوە بڕۆن و بەمیراتگریان دابنرێن. خوا لەسەر زمانی تێکڕای پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەڕووی نەیارەکانیان دا فەرموویەتی:

﴿ ...وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَا آذَيْتُمُونَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ إبراهیم-١٢-.

واتە: هەرچەندە ئازارمان بدەن و بەهەرچییەك سزاو ئازارمان بدەن بەدڵنیایی هەر خۆڕاگر دەبین و، با پشت بەستووانیش تەنیا پشت بەخوا ببەستن.

هەڵبەتە ئەمانە دە (١٠) خەسڵەت و ئاکاری پەسندی بنەڕەتیی و زەقی زانا و پێشەوایانی شایستەی مینبەر و میحرابی پێغەمبەری خوان (صلی الله علیه وسلم)، ئەگەرنا خەسڵەتی بەرز و پەسندی پێویست، بۆ زانا و پێشەوایان زۆر زۆرن.



# تەوەری سێیەم

## چەند هەڵە و پەڵە و کەم و کوڕییەك، کە پێویستە ئەهلی مینبەر و میحراب خۆیانیان لێ بپارێزن

بەرێـــزان!

هەرچەندە ئێستا بەتایبەت باسی زانایان و ئەهلی مینبەر و میحراب دەکەم، بەڵام هەرچی بۆ زانایان پێویستە، بۆ خەڵکی دیکەش هەر پێویستە، بەڵام بێگومان بۆ ئەوان پێویستترە، لەبەر ئەوەی خەڵك زیاتر ئیسلامیان تێدا دەبینێ و پتریان لێ چاوەڕێ دەکات، ئەگەرنا مامۆستایان و زانایانیش هەر لە ئیماندارانن، ئنجا لەنێو ئیمانداران دا هەندێکیان پسپۆڕ و شارەزاتر دەبن و لەدیندا پێشیان دەکەون، هەرچەندە دیسان شارەزابوون و لەدین و بەرچاوڕوونیی لەدینداریيدا، لەسەر هەموو مسوڵمانان فەرزە، بەڵام هەموویان بۆیان ناکرێ تێیدا پسپۆڕ و شارەزابن، وەك خوای زاناو شارەزا لە سووڕەتی: (التوبة)دا دەفەرموێ:

﴿ ۞ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾ -التوبة-.

واتە: بڕواداران نابێ هەموویان تێکڕا بچن بۆ جەنگ و جیهاد، دەبێ لەهەر کۆمەڵێکی زۆریان، کۆمەڵێکیان، بچن بۆ ئەوەی لە دیندا شارەزابن، دوایی بگەڕێنەوە بۆلای خەڵکەکەیان و ئاگاداریان بکەنەوە، بەڵکو خۆیان بپارێزن.

ئەگەرنا مسوڵمانان دەبێ هەموویان هەوڵبدەن شارەزابن و بەرچاو ڕوون بن.

ئەو هەڵە و پەڵانەی کە من باسیان دەکەم، لە دوو بواردا باسیان دەکەم:



## بواری یەکەم: قسەو وتارو ئامۆژگاریی

بەڕێـزان! مامۆستایان!

ئەگەر ئەمڕۆ چاوێك بە ئەهلی مینبەر و میحڕابی وڵاتی خۆماندا بخشێنین، لە هەرێمی کوردستاندا، هەروەها ئەگەر فراوانتریش بڕۆین، چەند هەڵەیەك و کەم و کوڕییەك، هەن، کە لە ئەهلی مینبەر و میحراب ناوەشێنەوەو، دەبێ خۆیانیان لێ بپارێزن، ئنجا من حەوت (٧) لەو هەڵەو پەلانەم هێناون، کە پێم وایە لەم ڕۆژگارو واقیعەمان زۆرترین زیانیان هەیە:

### ١- بەبێ زانیاریی قسەکردن و فەتوادان:

بەبێ زانیاریی قسەکردن دەربارەی دین، بەبێ ساغکردنەوەی تەواوو لێکۆڵینەوەی پێویست، بۆ وێنە: جار جار دەبینم لەسەر هەندێ لە کەناڵەکان مامۆستایەك دادەنیشێ، چەندان پرسیاری لێدەکەن، کەمتر دیتوومەو ئەگەر بڵێم: هەر نەمدیوە، ڕەنگە ئەوەش هەر ڕاست بێ، کە لە وەڵامی یەکێ لەو پرسیارانەدا بڵێ: نازانم، ئنجا هەر بەوەندەش ناوەستێ، کە بڵێ: دەزانم، بەڵکو فەتواش دەدات! کە بێگومان ئەوە نابێ وابێ، پێغەمبەری خاتەم (صلى الله علیه وسلم)، پێش ئەوەی بڕۆین بۆ هاوەڵان و بۆ پێشەوایان، هەر پێغەمبەری خاتەم (صلى الله علیه وسلم) خۆی پرسیاری لێکراوە دەربارەی سێ شتان، فەرموویەتی: نازانم،

چاوەڕێم بکەن، دوایی وەڵام دەدەمەوە، لەبارەی: (روح) و (أصحاب الكهف) و (ذوالقرنين)ەوە، پرسیاری لێکرا، قوڕەیشییەکان نامەیەکیان لەبارەی پێغەمبەری خواوە بۆ جوولەکەکانی مەدینە نارد، داخۆ چۆنی تێ دەگەن و چی بکەن؟ پێشنیاریان بۆکردن کە ئەو سێ پرسیارە لە پێغەمبەری خوا بکەن، ئەوانیش ئەو سێ پرسیارەیان لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کردن و فەرمووی نازانم، بەڵام مۆڵەتم بدەن بەیانی وەرنەوە، کەچی بەیانیش نەبووەو هەندێك گوتوویانە: مانگێکی پێچووە، یان کەمتر، یان زیاتر، دوایی خوای زانا (سبحانه وتعالى)، لە سورەتی (الكهف)دا، وەڵامی دوو پرسیاریانی دایەوەو[1]، لە سوورەتی (الإسراء)یش دا، وەڵامی ڕووح[2]، ئامۆژگارییشی کردو فەرمووی:

﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىۡءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلۡ عَسَىٰٓ أَن يَهۡدِيَنِ رَبِّي لِأَقۡرَبَ مِنۡ هَٰذَا رَشَدًا ﴿٢٤﴾ ﴾.

واتە: جارێکی دیکەی بۆ هیچ کارێکی دیکە مەڵێ بەیانی دەیکەم، مەگەر بڵێی: ئەگەر خوا بیەوێ، یادی خواش بکەو هەرکاتێك لەبیرت چۆوە، بڵێ: نیزیکە خوا بۆ لەوە سەرڕاستانەتر ڕێنماییم بکات، یانی: لەمەودوا وریاتر بی و لەخۆڕا بەڵێن نەدەی، بڵێی: بەیانی یان دوو بەیانی، فڵانە کارە دەکەم[3].

---

(١) کە بریتیی بوون لە: (أصحاب الكهف) و (ذي القرنين).

(٢) لەئایەتی ژمارە (٥٨)دا.

(٣) بۆ درێژەی ئەو بەسەرهاتە بڕوانە: (الإستيعاب في بيان الأسباب) ج٢، ص



**٢- بەپێی ئارەزووی خەڵك قسەکردن و هەڵوێست وەرگرتن:**

یەکی دیکە لە هەڵەکانی هەندێك لە ئەهلی مینبەر و میحراب، ئەوەیە کە: بەپێی ئارەزووی خەڵك قسە بکات، بەپێی پێخۆش بوون و کەیف پێ هاتنی خەڵك! کەسانێك هەن پێیان خۆشە هەرچی حەرامە بۆیان حەڵاڵ بکەی، ئەو ئەو جۆرە خەڵکە بەدوای ئارەزووی خۆی دەکەوێ، بەڵام خەڵکی مسوڵمان وانیە، مامۆستای ئەهلی مینبەرو میحراب دەبێ وریا بێ، بەدوای ئارەزووی خەڵك نەکەوێ بەدوای (هُدی)ی خوا بکەوێ، نەك بەدوای (هَوی)ی خەڵك، خوای پەروەردگار دەفەموێ:

﴿ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ أَهۡوَآءَهُمۡ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ ﴾، المؤمنون -٧١-.

واتە: ئەگەر حەق بەدوای ئارەزووی خەڵك کەوتبایە، ئاسمان و زەوی و ئەوانەی تێیاندان، هەموویان تێك دەچوون.

چونکە بۆ نموونە: یەك دەڵێ: خوایە! باران بباریێ، یەك دەڵێ: با نەباریێ ، یەك دەڵێ: با سەرمابێ، یەك دەڵێ: با گەرما بێ، ...هتد، بەڵام خوا ئەم گەردوونەی داناوە بەسیستمێکی دادگەرانەی عیلمییانە بەڕێوەدەچێ، نەك بەدوای ئارەزووی خەڵك بکەوێ، مامۆستایان و ئەهلی مینبەرو میحراب نابێ بەپێی پێخۆش بوون و ئارەزووی خەڵك،

---

٠٧٤، ١٧٤، ذكره السيوطي في (الدر المثور) (٦٧٣/٥) و نسبه لابن المنذر، قلنا: وسنده ضعيف.

یان بەپێی کەش وهەوای مەجلیس، بزانێ مەجلیسەکە چۆنی پێ چاکە، وابڵێ، لێرە شتێك بڵێ و لەولا شتێك بڵێ، ئەمڕۆ شتێك بڵێ و بەیانی شتێکی دیکە بڵێ، قسەی دژ و پێچەوانە و پێکەوە ناکۆك!

**٣- قسەو وتار گوتن بەگوێرەی ئارەزووی حوکمڕانان:**

هەروەها ئەهلی مینبەر و میحراب، دەبێ لە قسەو وتاریان دا خۆیان بپارێزن لە شوێنکەوتنی ئارەزووی حوکمڕانان، ئەوحوکمڕانانەی کە چاویان لەوەیە هەمووشتێکیان بۆ ڕەوابێ، چاویان لەوەیە کە ئەوان چۆنیان پێخۆشە دنیاو خەڵك ئاوابێ، کە بەداخەوە هەم وتاربێژو هەم حوکمڕانی لەو جۆرەمان زۆرن، بەڵام من وەك دڵسۆزێك بۆ هەموو لایەك، ئەمڕۆ دنیایە سبەینێ قیامەتە، کەسێك کە بەناوی دینەوە قسە دەکات، زۆر شتێکی گەورەیەو دەبێ زۆر وریابین، (إبن قيم الجوزية) کتێبێکی هەیە چوار بەرگە، بەناوی (إعلام الموقّعين عن رب العالمين) یانی: [ئاگادارکردنەوەی ئەوانەی ئیمزا دەکەن بەناوی پەروەردگاری جیهانەوە]، چونکە زانا کە فەتوا دەدات بەناوی پەروەردگارەوە ئیمزا دەکات، بۆیە دەبێ زۆر وریابێ، چونکە دوایی چەند کەس بەو فتوایەی وی ئەگەر هەڵەبێ و کاربکەن، گوناحی هەموویانی دەکەوێتە ئەستۆ، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: [(القضاة ثلاثة: قاضيان في النار، وقاضٍ في الجنة رجل قضى بغير الحق فعلم ذلك، فذاك في النار وقاض لا يعلم فأهلك حقوق الناس فهو في النار، وقاض قضى بالحق فذلك في الجنة)] رواه الترمذي: ١٣٢٢، وصححه الألباني.



واتە: قازییەکان سێ قازیین (ئەوانەی کە دادوەریی) دەکەن، دوویان لە جەهەندەمێ دان و یەکێکیان لە بەهەشتە، قازییەك کە نازانێ و بەنەزانیی حوکم دەدات، ئەهلی ئاگرە، هەروەها قازییەك کە حەقێ دەزانێ و، بەپێچەوانەی حەق حوکم دەدات، ئەویش ئەهلی دۆزەخە، بەڵام قازییەك کە حەقێ دەزانێ و بە حەقیش حوکم دەدات، ئەوە دەربازبوویە و ئەهلی بەهەشتە.

ئنجا موفتیش هەروایەو قسەکردنیش بەناوی خوای تاك وپاکەوە (سبحانە وتعالی) هەروایە.

**٤- زۆر حیکایەت وبەسەرهات گێڕانەوەی واقیعیی یان مێژوویی:**

شتێکی دیکە بۆ ئەهلی مینبەر و میحڕاب، کە پێویستە خۆیانی لێ بپارێزن، ئەوەیە کە کاتێك باسی دین دەکەن، دەبێ بگەڕێنەوە بۆ قورئان و سوننەت، نەك هەر ملی حیکایەتان بگرن، ئنجا ئەو حیکایەتانەی کە لە مێژوو دابوون، زۆریان ئەفسانە و بێ بنەمان هەروەها ئەو حیکایەتانەی کە لە ژیانی ڕۆژانەماندا هەن، ڕەنگە زێدەڕۆیی و گۆڕین ودەستکاریی زۆریان تێدابکرێ، بەڵێ دەگونجێ وتاربێژ شتێك بگێڕێتەوە لەمێژوودا، یان لەئێستادا بۆ پەند لێوەرگرتن، بەڵام وتار هەمووی ببێتە حیکایەت، دوایی دەبینی، مەلایەکە ساڵێك وتاری بۆ خەڵك داوە هەمووی حیکایەتە! نەخێر دوو ئایەتیان بۆ تەفسیر بکە، سێ فەرمایشتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)یان بۆ باس بکەو، چوار بنەمای شەرعییان بۆ بخەڕوو و بەرچاویان ڕوون بکەوە، تاکو بزانن ئیسلام چۆن و چییە؟.

**٥- زۆر هاوارکردن و دەنگ هەڵێنانی بێ پاساو:**

شتێکی دیکە کە دەبێ خۆی لێ بپارێزرێ، ئەوەیە کە هەندێك لە ئەهلی مینبەر و میحراب، لەسەر مینبەری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زۆر هاوار دەکەن و دەنگ بەرز دەکەنەوە، هەروەها هەیانە زۆر سوێندان دەخوات! بێ ئاگا لەوەی کە زۆر سوێند خواردن زۆر خراپە، خوای پەروەردگار لە سوورەتی(قلم) لەئایەتی -١٠- دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ ﴾.

واتە: {ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)} فەرمانبەریی کەسێك مەکە کە زۆر سوێندان دەخوات و سووکە، چونکە کەسێك زۆر سوێندان دەخوات، کە متمانەی بە قسەی خۆی نەبێ، هەیە لەسەر شتێك سوێند دەخوات، کە جارێ بۆخۆیشی ساغی نەکردۆتەوە!

**٦- بەرەهایی (إطلاق) قسەکردن و حوکم و بڕیاردان:**

شتێکی دیکە کە دەبێ لەلایەن ئەهلی مینبەرو میحرابەوە خۆی لێ بپارێزرێ، بریتیە لە: بەرەهایی قسە کردن، کەسێك ناشەرعییەکی دەکەوێتە بەرچاو، دەبێ بڵێ: ئەو ناشەرعییە کە لە فلان کەسە، یان لە فلان شوێنە ڕوویداوە، نەك بێنێ ئەو خەڵکە هەمووی تێوەربدات! زانای ئایین دەبێ خۆی لە: بەرەهایی قسەکردن وگشتاندن (إطلاق وتعمیم) بپارێزێ، بۆ خۆشیی بۆتان دەگێڕمەوە: جارێك دوای





مانگی ڕەمەزان بوو، لەمزگەوتێك لە هەولێر چووم بۆ نوێژی جومعە، نازانم کەسانێك مامۆستایەکەیان لەسەرچی تووڕە کردبوو؟ دیاربوو لە وتارەکەیدا گوتی: خەڵکینە هەرکەسێك لە دوای ڕەمەزان درۆیەك بکات، غەیبەتێك بکات، پارووپەکی حەرام بخوات، بابەتەمای یەك ڕۆژوو نەبێ هەمووی هەڵوەشاوەتەوە، منیش دوای وتارەکە گوتم: مامۆستا! ئەوە چۆن بوو واتگوت؟ خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ:

﴿إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ هود-١١٤-.

واتە: چاکەکان خراپەکان دەسڕنەوە، بەڵام لە قورئانێدا نیە، خراپە چاکان بسڕێتەوە! ئنجا ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانێ، ئەگەر خوا قبووڵی کردبێ، چۆن هەڵدەوەشێتەوە؟ بۆچی وات گوت؟! گوتی: مامۆستا! ویستم بیانترسێنم بۆ ئەوەی گوناحان نەکەن.

گوتم: ئنجا مامۆستا! نابێ خەڵك بەدرۆیان بترسێنرێ، دەبێ دینی خوا چۆنە، ئاوا بیانترسێنی، ئنجا تۆ واتکرد ڕەنگە ساڵێکی دیکە هەندێك لەو گوێگرانەی تۆ بڵێن: با ڕەمەزانەکە نەگرین، مادام بە دۆیەك هەڵبوەشێتەوەو بە پارووپەکی حەرام، بەخوا هەر لێی گەڕێین چاکترە، هەرماندوو بوونمان پێ دەبڕێ! گوتم: دەبێ دینی خوا بە عاتیفە و سۆزی خۆمان نەخەینە ڕوو، حەقیقەتە شەرعییەکان چۆنن ئاوا بیانخەینە ڕوو و بەیانیان بکەین.

**٧- خۆ لێبوون بە وەکیلی خواو بەهەشت و دۆزەخ بەدەست بوون:**

شتێکی دیکە لە بواری وتاردان و ئامۆژگارییدا، کە ئەهلی مینبەر و میحراب دەبێ خۆیانی لێ بپارێزن، ئەوەیە: لێیان تێك نەچێ: کە ئەوان ئەو پەڕەکەی ترسێنەر و ورياکەرەوەن، بەڵام وەکیلی خوا نین، خوا (سبحانه وتعالى) بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٌۖ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ﴿٦٥﴾ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ ﴿٦٦﴾ ﴾ ص: ٦٥-٦٦.

واتە: تۆ پێیان بڵێ من تەنها وریا کەرەوە و ترسێنەرم.... یانی: وەکیلی خوا نیم و بەهەشت و جەهەننەم، بەدەست من نین، هەندێك لە مامۆستایان وا قسە دەکەن دەڵێی لەلایەن خواوە هاتوونەوەو، بەهەشت عایدی وانە، کێیان پێ خۆشبێ دەیخەنە نێوی و، کێش لێی تووڕەبن دەیخەنە جەهەننەمێ! بەڵام (أبو جعفر الطحاوي) لە (مەتنی عەقیدەی طەحاویی)دا دەڵێ: بە نیسبەت ئوممەتی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم): (وَلا نُنزِل أحَداً مِنْهُم جنَّةً وَلا ناراً)، یانی: هیچکامان لە بەهەشت و جەهەننەمێ دانابەزێنین، ئێمە نەقڵیاتی بەهەشت و جەهەننەممان دانەناوە! ئنجا خەڵك پێویستە سروشتی ئیسلام چۆنە، ئاوا بدوێنرێ، نەك وەك ئەوەی پێمان خۆشە، یان وەك ئەوەی ڕقمان لەکەسێك هەڵساوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (موعازی کوڕی جەبەل) و یەکی دیکەی لە هاوەڵانی ناردن بۆ یەمەن، سێ ئامۆژگاریی کردن فەرمووی: (يَسِّرا ولا تُعَسِّرا، وبَشِّرا ولا تُنَفِّرا، تَطاوعا ولاتختلفا) رواه

البخاري: ٢٨٧٣ ومسلم: ١٧٣٣، فەرمووی: دین بۆ خەڵك ئاسان بکەن و، لێیان وە زەحمەت مەخەن، هەروەها خەڵك دڵخۆش بکەن و مەیانسڵەمێننەوەو مەیانترسێنن، هەروەها لەنێو خۆشتاندا تەبابن و پێکەوە ناکۆك مەبن و دەمەقاڵێی و ناکۆکییتان نەبێ.

بەڵێ ئەگەر ئەهلی مینبەر و میحراب پێکەوە ناکۆك بن و دەمەقاڵێیان هەبێ، خەڵکی چۆن یەکریز دەکەن و چۆن یەکرەنگ دەکەن، خەڵك گوێ لە کامیان بگرێ؟

لەبواری قسە و ئامۆژگاریی دا، پێویستە خۆمان لەو حەوت هەڵانە بپارێزین.




## بواری دووەم: ئاکارو ڕەفتارو هەڵوێست

لە بواری هەڵوێست و هەڵس و کەوت و ئاکار و ڕەفتاریش دا، دەبێ خۆمان لە حەوت (٧) جۆرە هەڵەو لادان بپارێزین:

**یەکەم: بێهێزیی لەبەرانبەر ترس و تەماعدا:**

ئەهلی مینبەر و میحڕاب نابێ بێهێزبن لەبەرانبەر ترسدا، یەکیان بە پخەیەك لە هەموو شت پەشێمان ببێتەوە! هەروەها لەبەرانبەر تەماعدا، چونکە هەمیشە ئەوانەی کە دژی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بووون وناحەزی پەیامی خوا بوون، پەنایان بردۆتە بەر خاڵە بێ هێزەکانی مرۆڤ (نقاط ضعف الإنسان)، وەك:

أ- ترساندنی و،

ب- تەماع وەبەرنانی و،

ج- چەواشەکردنی،

ئەو سێ کوچکەیە ئەگەر تەماشا بکەین، لە بەسەرهاتی مووسا (علیه الصلاة والسلام) و فیرعەوندا خوا (سبحانه وتعالی) باسی ئەو سێکوچکە (ثالوث)یە دەکات:



١- باسی فیرعەون دەکات، کە ڕەمزی خۆسەپاندن (إستبداد) و ترساندنی خەڵك بووە.

٢- باسی (قارۆون) دەکات، وەك ڕەمزی چەوساندنەوەی ئابووریی و بەپارە کڕین و فرۆشتن کردن بە خەڵك بووە.

٣- باسی (هامان) دەکات وەك ڕەمزی چەواشەکاریی و ڕاگەیاندنی فریودەرانە، هەرحوکمێکی ستەمکار (غاشم) وخۆسەپێن کە خۆ بەسەر خەڵکی دا فەرز دەکات، پەنا دەبات بۆ ئەو سێ شتە: ترساندنی خەڵك بە دەسەڵات، تەماع وەبەرنانیان بەلایەنی ئابووریی و، چەواشەکردنیان بەلایەنی ڕاگەیاندن (إعلام).

بەڵێ ماموّستایان! ئەهلی مینبەر و میحراب، دەبێ بەهێزبن لەبەرانبەر ترسدا، لەبەرانبەر تەماعدا، نە ترسنۆکیی تەمەنی کەسی درێژ کردوە، نە ئازایەتیی تەمەنی کەسی کورت کردوە، مرۆڤ هەرکەسە لەکاتی خۆیدا و بەوشێوەیە کە خوا بۆی بڕیارداوە، لەو کاتەدا ئەم ژیانی دنیایە بەجێ دێڵێ، ئەگەر هەموو خەڵکی دنیا کۆببنەوە ناتوانن سەعاتێك ژیانی تۆ کورت بکەنەوە، یان درێژی بکەنەوە، هەڵبەتە مامۆستایانیش زۆرجار ئەوە بۆ خەڵك باس دەکەن و، دەبێ بۆخۆیان بەکردەوە لە خۆیان دا پراکتیزەی بکەن، بەڵام قسەکردن ئاسانەو، ئیش پێکردنی ئاسان نیە، بۆیە پێویستە وریای قسەکانمان بین!

**دووەم: بێ هێزیی لە بەرانبەر هەوا و ئارەزوودا:**

ئەهلی مینبەر و میحڕاب دەبێ وەك کێو وابن، لە بەرانبەر ئارەزووان و گومانان (شهوات وشبهات)دا و، زۆر دامەزراو بن، چونکە بەڵێ مرۆڤ مرۆڤە، تووشی هەڵە دێ، بەڵام بێگومان ئەهلی مینبەر و میحراب ناحەزیان زۆرن، زۆرکەس لێیان لە بۆسەدایە / هەر غەڵەت و پەڵەتێکیان هەبێ، دوایی کوت کوت دەهۆڵی بۆ دەست دەدەنێ، بۆیە دەبێ زۆر لەخۆیان وریابن، وەك گوتمان: ئینسان تاکو شوێنی بڵندتر بێ، خەڵك زیاتری دەبینێ و، هەتا پێگەشی بەرزترو دیارتربێ، خەڵك چاوەڕوانیی زیاتریان لێی هەیە.

**سێیەم: خۆپەسندیی و خۆبەزلگریی:**

پێشەوای ئایینی دەبێ خۆی بپارێزێ لە خۆ پەسندیی و خۆ بەزلگریی و خەڵك پێ خراپ بوون: ئەهلی عیلم و مینبەر و میحڕاب، ئەگەر خوا ڕەحمیان پێ بکات، هەڵبژێردراوی نێو کۆمەڵگا و خەڵکن، بەڵام هەر لەگۆترەنا و دەبێ سیفەتە پێویست و بەمەرج گیراوەکان لەخۆیان دا بهێننەدی، بەڵام نابێ ئەوە وایان لێبکات: خۆیان لەلا زل بێ و قسەی حەق وەرنەگرن، پێشنیارو ڕەخنە وەرنەگرن، پرسیارو ڕاوێژ نەکەن بەخەڵك، یاخود پێیان وابێ خەڵك هەمووی بەهیلاك چووە، ڕەش بینیی و بەخشینەوەی ڕەش بینیی بەنێو خەڵکدا، شتێکی خراپە.

**چوارەم: بوغڕانەبوون و لەکەوڵی خۆ دەرنەچوون بەهۆی چوونە سەر مینبەرەوە:**

مامۆستاو ئەهلی مینبەرو میحراب لەبەر ئەوەی شارەزایەو ئامۆژگاریی خەڵك دەکات، دەبێ لەخۆیان وریابن و بەو هۆیەوە لە کەوڵی خۆیان دەرنەچن و لەخۆیان بایی نەبن، یەکیان وابزانێ: لەبەر ئەوەی لە نوێژدا لەپێش ئەوانەوەیە، لەبەهەشتیش لەپێش هەمووانەوەیە! یان لەبەر ئەوەی لەسەر مینبەرێیە و لەهەمووان بڵندترە، پێی وابێ لە بەهەشتێ پلەی لە هەمووان لەپێشترە! نەخێر لە بەهەشت دا حیساب و کیتاب بە تەقوایە، بە کردەوەی چاکە، بەئیخلاس و بۆ خوا سوڵحانەو، مەرجیش نیە، کێ لەدنیادا چۆتە شوێنێکی بڵندتر، لەبەهەشتێش لەوان بڵندتربێ! مامۆستایانی بەڕێز! خۆ بەکەمگریی (تواضع) هەموو کەس جوان دەکات و بەپێچەوانەوە: خۆ پەسەندیی و خۆ بەزلگریی و بوغڕابوون، هەر لە دەسەڵاتدارێکەوە هەتا شوانێك، مرۆڤی پێ ناشیرین دەبێ، بەتایبەتی ئەهلی عیلم و مینبەر و میحراب، خەڵك وایان لێ چاوەڕوان دەکەن خاکیی بن، (متواضع) بن، نەرم و نیان بن، خۆیان پێ لە خەڵکی زیاتر نەبێ، بەوە زیاتر دەچنە دڵی خەڵکەوە.

**پێنجەم: شەرمکردن لە گوتنی حەق:**

ڕەفتارێکی دیکە کە دەبێ لەلایەن ئەهلی مینبەر و میحرابەوە خۆی لێ بپارێزرێ، بریتیە لە: شەرمکردن لە گوتنی حەق و، بوێرانەو ڕاشکاوانە ڕاگەیاندن و ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکانی ئیسلام، بەو شێوەیەی کە لە قورئان

و سوننەتدا هاتوون، بەڵێ دەگونجێ ڕاستییەك لە شوێنێك نەڵێی و کاتی نەهاتبێ، یان بۆ ئەو شوێنە گونجاو نەبێ، بەڵام کە گوتت، دەبێ خوا چۆنی فەرمووە، ئاوای بڵێی، یانی: دەبێ حەقێ بڵێی، مەرج نیە هەموو هەقێك بڵێی، بەڵام ئەوەی گوتت، دەبێ وەك خوا دایبەزاندوە، ئاوای بڵێی.

**شەشەم: تێکەڵیی لەگەڵ ئەهلی دنیاو ساماندارداو بەهاندەری تەماع و بەهرەی خراپ وەرگرتن:**

کردەوەیەکی دیکە دەبێ ئەهلی مینبەر و میحراب خۆیانی لێ بپارێزن، بریتیە لە تێکەڵیی لەگەڵ ئەهلی سامان و ماڵ، وەك تەماع تێکردنی ماڵەکەیان! هەندێ کەس دەناسم ڕەنگە دراوسێی هەژار و نەداری هەبن، هامووشۆیان نەکات، لەو شارە قەرەباڵغانە هی وا هەیە، دراوسێی مسوڵمان و دینداری چاکی هەن، بەڵام هەژارن، ڕەنگە سەلامیان لێ نەکات، کەچی ڕەنگە هەموو هەفتان ئامادەبێ بچێ لەماڵی دراوسێیەکی دەوڵەمەندی دەعوەتبێ! کە ئەوە زوعفە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (بئس الطّعام طعام الوليمة، يُدعى إليها الأغنياء ويُترك الفقراء) رواه البخاري: ٥١٧٧، ومسلم: ١٤٣٢.

واتە: خراپترین خواردن خواردنی وەلیمەیە[1]، لەبەر ئەوەی دەوڵەمەندان و ناسراوانی بۆ بانگ دەکرێن و، خەڵکی هەژار و نەداری لێ تەرك دەکرێ.

---

(١) (الحافظ ابن حجر العسقلاني) لە (فتح الباري) (ج٩، ص٥٤٢) دا گوتوویەتی: (الوليمة إذا أطلقت حُمِلَتْ على طعام العرس بخلاف سائر الولائم فإنّها تُقَيَّد) واتە: (وليمة) ئەگەر بەرەهایی بەکارهێنرا، مەبەست پێی ئەو خواردنەیە کە بەبۆنەی بووك گواستنەوەوە سازدەکرێ...



ئێمە دەبێ وریا بین و دڵمان بە ئەهلی ئیمان و ئەهلی مزگەوتەکەی خۆمان و، ئەوانەی لە دەور و پشتمان نوێژ دەکەن و، لەگەڵماندان بەرێی خوادا، دڵمان بەوانە خۆشبێ، با گیرفانیشیان خاڵیی بێ، بەڵام ئەوانی دیکە با گیرفانیان پڕ بێت، مادام دەروونیان لە ئیمان و تەقوا بۆش بێ، هیچ نیە، هەڵبەتە کەسێك دەوڵەمەند و صالح بێت، زۆر باشە، بەڵام ئەهلی مینبەر و میحراب دەبێ لەوە وریابن، کە پارە و سامان و خواردن و چی و چی بکەنە بناغەی پەیوەندییەکانیان.

**حەوتەم: شوێنکەوتنی ئەو لایەنە سیاسییانەی بەرنامەیان جگە لە ئیسلامە:**

حەوتەم ڕەفتار کە دەبێ ئەهلی مینبەرو میحراب خۆیانی لێ بپارێزن، بریتیە لە شوێنکەوتنی حیزبە عەلمانییەکان، ئەو حیزبانەی کە غەیری قورئان و سوننەت بەرنامەیانە، نابێ شوێنیان بکەون، لەگەڵ لایەنێکی ئیسلامییدا نی، مەبە، لەماڵی خۆتبە، باشە، بەڵام نابێ ببیە پاشکۆی حیزبێك کە بڕوای بە بەرنامەکەی تۆ نیە، زۆر جاران گوتوومە: حیزبێکی عەلمانیی مامۆستا دێنێ دەیباتە سەرەوەی مەجلیسێ، دەبێ پێی بڵێ: لەبەرچی ڕێز لەمن دەگری، لەبەر شەخسی خۆمە؟ دەڵێ: نەخێر! لەبەر ئەوەی تۆ مامۆستای، دەبێ بڵێ: من مامۆستام بەهۆی ئەو قورئان و سوننەتەوە، من ئەو قورئان و سوننەتە خزمەت دەکەم، بۆیە خەڵك پێش خۆیان خستووم، ئنجا ئەگەر تۆش لەبەر ئەو قورئان و سوننەتە ڕێز لە من دەگری، لەپێشدا

ڕێز لە قوڕئان و سوننەتەکە بگرە، ڕێز لەمن مەگرە، کڵاوم لەسەر بنێی و قوڕئانەکەشم وێڵ بکەی! ئەگەر ڕاست دەکەی، ڕێز لەمن دەگری، ڕیزی ئەو قوڕئان و ئیسلام و ئەو عیلمە شەرعییە بگرە، کە من پەیڕەویی لێ دەکەم، ئنجا ڕێز لەمن بگرە، من خزمەتکاری ئەو قوڕئان و سوننەتەم، دەبێ مامۆستا ئاوا بڵێ، نەك دوو مەرحەبای بکەن و سەلامێکی لێبکەن، بەزمانی حاڵ و واقیع بڵێ: قەیناکات چی دەیکەن با بیکەن، مادام ڕێزیان لەمن گرتوە و مەرحەبای منیان کردوە! ئەدی نابێ بپرسی: لەگەڵ دینەکەت دا بەینییان چۆنە؟!.

www.alibapir.com

## تەوەری چوارەم

# چارەسەری هەڵە و پەڵە و کەم و کوڕییەکان



بەڕێـــزان!

بێگومان ئەهلی مینبەرو میحراب، مامۆستایان و شارەزایانی ئیسلام جێی هەموو ڕێزو حورمەتێکن، چونکە لە وڵاتی ئێمەداو لە وڵاتانی ئیسلامییدا، ئەگەر دینداریی مابێ، زانایان هێشتوویانەتەوە، ئەگەرنا کێ هێشتوویەتەوە؟ زاناو پێشەوایان بەردەوام لەگەڵ مسوڵمانانندا بوون، ڕێنمایی و ئامۆژگارییان کردوون و، حەڵاڵ و حەرامیان بۆ باس کردوون، چاکە و خراپەیان بۆ لێك جیاکردوونەوە، بۆیە ئەگەر من جارێك خەم لە خەڵکێکی دیکە بخۆم، دەبێ دە (١٠)جاران خەم لە زانایان بخۆم و، ئەوە بە ئەرکی سەرشانمی دەزانم، هەمووتان ڕەنگە بزانن من کتێبێکم هەیە، بەناوی: {زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن؟}.

ئەو کتێبە تائێستا سێ جاران بە کوردیی[1] چاپ کراوە و بڵاوکراوەتەوە، دەوری (٤٠٠) لاپەڕەیە بەتەفصیلْ باسی ئەوەم کردوە، کە زانایانی ئیسلام دەبێ: خاوەنی چ کەسایەتییەك بن و چۆن بن؟ هەروەها تێیدا باسی ژیان و هەڵوێستی بیست و یەك (٢١) لە زانایانم کردوە، لە پێشەوایانی خۆمان، هەر لە حەسەنی بەصرِاییەوە پێدا وەرە، تاکو دەگاتە سەر زانایانی دوایی و کۆتاییم بە (سەید قوطب) هێناوە (ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێ)[2]، بەڵێ زانایان و ئەهلی مینبەر و

---

(١) هەروەها بەزمانی عەرەبییش تاکو ئێستا سێ جاران چاپ کراوە، چاپی سێیەم لە (دار المعراج/٢٠٢٠م).

(٢) ئەمەش ناوی ئەو زاناو پێشەوایانەیە بەپێی ئەو ڕیزبەندییەی کە لە کتێبەکەدا هێناومن:

١- حەسەنی بەصرِایی



میحرابمان دەبێ ئاگامان لێیان بێ، وەك چاوی خۆمان بیانپارێزین و ئاگامان لێیان بێ، بەتایبەت ئەوانەیان کە ڕاست دەکەن لەگەڵ دینی خوادا و، ساغن و دڵسۆزن بۆ خواو بەپەرۆشن بۆ خەڵکی خوا، هەڵە و کەم وکوڕییش هیچ کەس نیە نەیبێ و، دەبێ بۆیان ڕاست بکەینەوە، بەڵام لێزانانەو دڵسۆزانە، چونکە، خێرێك ئەگەر هەبێ بە ئەهلی

---

٢- عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی (زين العابدين)

٣- عومەری کوڕی عەبدولعەزیز

٤- زەیدی کوڕی عەلی (ئیمام زەید)

٥- سوفیانی ثەوریی

٦- ئەبوو حەنیفە (الإمام الأعظم)

٧- ئیمام جەعفەری صادیق

٨- ئیمام مالك

٩- ئیمام شافیعی

١٠- ئیمام ئەحمەد

١١- ئەبولحەسەنی ئەشعەریی

١٢- ئیمام غەزالی

١٣- شێخ عەبدولقادری گەیلانیی

١٤- ئیمام نەوەویی

١٥- شێخ ئەلعیز کوڕی عەبدولسسەلام

١٦- شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمییە

١٧- مامۆستا مەلا سەعیدی نۆرِسیی

١٨- شێخ ئەمجەدی زەهاویی

١٩- مامۆستا حەسەنولبەننا

٢٠- مامۆستا ئەبولئەعلای مەودوودیی

٢١- مامۆستا سەیید قوطب

عیلمەوەیە، ئەهلی جەهل چی پێدەکرێ؟ بەڵام مامۆستایانی ئەهلی مینبەر و میحراب، دەبێ بزانن کە ئێستا -لەم ڕۆژگارەدا- جگە لەوانیش، خەڵکی دیکەش هەیەو پەیدا بووە، کە لە دیندا شارەزایە، بەڵێ لەڕاستییدا دین کە هێڵراوەتەوە، لە نێو مسوڵمانان دا، چ لەنێو میللەتی کورد، چ تورك، چ فارس، چ عەرەب...هتد، ئەهلی عیلم هێشتوویانەتەوە، ئنجا ئەو ئەهلی عیلمە، جاری وا هەیە هەر لەبەرگی مامۆستایەتییدا بوون، یان لەبەرگی شێخ و تەسەووف دابوون، یان لەبەرگێکی دیکەدابوون.

ئێستاش دەپرسین: ئایا ئەو کەم وکوڕییانەی لە تەوەری سێیەم دا لە چواردە خاڵان(٧+٧)دا باسمان کردن، دەبێ چۆن چارەسەری ئەو کەم و کوڕییانە بکرێ؟!

**یەکەم: چاو پێداگێڕانەوەی خواناسیی و ئیمان وخواپەرستیی و تەقوامان:**

مامۆستایان!

سەرچاوەی چارەسەرکردنی عەیب و کەم و کوڕییەکانمان و خاڵە بێهێزەکانمان، کە دوژمنان و ناحەزانمان لە خاڵە بێهێزەکانەوە زەفەرمان پێ دەبەن، ئەهلی دنیا، حوکمڕانان و خەڵکی دیکە زەفەر بەکێ دەبەن؟ بێگومان زەفەر بە کەسێك دەبەن کە لەبەرانبەر تەماع و ترس و چەواشەکاریی دا بێهێز و پێزە، چونکە ئەگەر بابای زاناو مامۆستا مەحکەم بێ، ئەو ناحەزە دڕندانە هەر لەڕێوە تەماعی تێناکەن! بۆیە یەکەم هەنگاوی چارەسەر بریتیە لە زیاتر و چاکتر خواناسیی و، ئیمانی خۆ زیاتر




دامەزراندن و، عیبادەت و، خۆ ساغ کردنەوەو، تەقوای خۆ باشتر کردن و، کە بێگومان بە ئیمان و تەقوا دەبینە دۆست و نیزیکی خوا:

﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾﴾ یونس: ٦٢-٦٣

واتە: ئاگاداربن! بێگومان دۆستانی خوا نە ترسیان لەسەرە نە پەژارە دادەگرن. ئەوانەی بڕوایان هێناوە و بەردەوام پارێزیان دەکرد.

**دووەم: کارکردنی جیددیی و بەبڕشت و بەردەوام لەسەر دەروون و ناخی خۆمان:**

بەڕێـــزان!

دەبێ زۆر کاربکەین لەسەر ناخی خۆمان، بەبێ ئەوە هیچ بەهیچ ناکەین، کە بەڕاستیی پسپۆڕانی بواری تەزکیەی نەفس کە بە ئەهلی تەسەووف و ئەهلی عیرفان ناسراون، ئەوانە مامۆستا و شارەزان لەوبوارەدا، بۆ وێنە: ئەوەی (ئەبو حامیدی غەززالیی) لەکتێبی: (إحیاء علوم الدین) لە (ربع المُهلكات والمُنجیات)دا هەم دەربارەی عەیبەکانی نەفس، باسی دەکات و هەم دەربارەی چۆنیەتی چارەسەرکردنی ئەو عەیبانەی نەفس، کەم زانای دیکە هەبوون لەو بوارەدا ئاوا قووڵ ڕۆچووبن، هەڵبەتە ئەویش بەرهەمی ئەوەبووە کە ئەو زانایە زۆر کاری لەسەر خۆی کردوە، بۆیە من وەك برایەکی دڵسۆزی خۆتان دەڵێم: با زۆر بەهرە وەربگرین لە کەلەپووری ئەهلی تەزکیەو ئەهلی تەسەووف، وەك چۆن بۆ حوکمە

فیقهییەکان دەگەڕێنەوە لای شەرعزانان و، بۆ زانینی واتای قورئان دەگەڕێینەوە بۆلای قورئانزانان و، بۆ حوکمی فەرموودەیەك لەڕووی سەنەدەوە، یان لە ڕووی واتاوە، دەگەڕێینەوە بۆلای پسپۆڕانی بواری سوننەت، دەبێ لەڕووی تەزکیەشەوە بگەڕێینەوە بۆلای پسپۆڕانی ئەو بوارە، شایانی باسە: ئەو ڕەوتەی کە لەسەرەتاوە بەناوی ڕەوتی وەهابیی هەبووە، دواتر ناوی جۆراوجۆری لێنراون، کە هەستیارەییەکی هەبووە بەرانبەر بەڕێبازەکانی ئەهلی تەسەووف و قوتابخانەکانی ئەهلی تەزکیە بەگشتیی، ئەوە زەرەبەی زۆر داوە، لەبواری کەمتەرخەمیی پەیدابوونی زۆر، لەڕووی تەزکیەی نەفسەوە، بۆوێنە: کەسێك دەبینی کتێبێکی بچووك دەخوێنێ لە عەقیدەدا، پێیوایە گەیشتۆتە ئەوسەری، بەڵام زۆرجار دینداریيەکی وشك و بی ڕووح وسەرکێڵی هەیە و، ڕووح وجەوهەری مسوڵمانەتیی و دینداریی تێدانیە، ئەوەی ئەهلی تەزکیە باسی دەکەن و، پێش وان زاناو پێشەوایانی پێشین باسیان کردوە وەك:

١- هەبوونی ئیمانێکی شهوودیی،

٢- چێژوەرگرتن لە خواپەرستیی،

٣- پشت بەخوابەستن،

٤- زۆر گوێ نەدان بەمەدح و زەمی خەڵك،

٥- ژیانی دنیا بەکەمگرتن و دواڕۆژ هەڵبژاردن،

٦- زۆر یادی خوا کردن،

٧- بەتامەزرۆییەوە ئەرکە شەرعییەکان ڕاپەڕاندن،





شایانی باسیشە: ئێمە لە هەرکام لەکتێبی: (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون) و کتێبی (ژیانی گیان)دا بەدرێژیی باسی (تەزکیەی نەفس)مان کردوە، هەروەها لەکتێبی (خواناسیی، ئایین، ئیمان)یش دا لەوبارەوە دواوین و، بێگومان ئەم کتێب وسەرچاوانەش لەوبارەوە سوودی زۆریان لێوەردەگیرێ:

١- (إحياء علوم الدين)ی (أبو حامد الغزالي).

٢- (إيقاظ الهمم في شرح الحكم)ی (ابن عجيبة).

٣- (الفتح الرباني والفيض الرحماني)ی (عبدالقادر الجيلاني).

٤- (التصوف والأخلاق)ی (ابن تيمية) كە دوو بەرگی (١٠ و ١١)ی (مجموع الفتاوى)كەینی.

٥- (مدارج السالكين شرح منازل السائرين)ی (ابن القيم).

٦- (كليات رسائل النور)ی (بديع الزمان سعيد النورسي).

٧- (تربيتنا الروحية)ی (سعيد حوّى).

بەڵام دەبێ وریابین و جگە لە کتێبی خوا عزوجل هیچ کتێب و بەرهەمێکی زانایان، لە هەڵەو کەم و کوڕیی پارێزراو نیە.

بەڵێ، دەبێ سوود لەو کەلەپوور و ئەزموون و بەرهەمەی ئەوانە وەربگرین، ئەگەر بمانەوێ: هەوڵ بدەین ناخی خۆمان چاکتر و پاکتر بکەین.

**سێیەم: کەم و کوڕیی و عەیب و ناتەواویی خۆ دیتن:**

بەڕێــزان!

وەك گوتراوە: (فهم السؤال نصف الجواب) لەپرسیار تێگەیشتن نیوەی وەڵامە، مرۆڤ تاکو هەڵەو کەم وکوڕییەکانی خۆی نەبینێ، ناتوانێ چاکیان بکات، بۆیە پێویستە بەردەوام سەرگەرمی خۆ پشکنین (تفحُّص) بین، بۆ دۆزینەوەی هەڵەو پەڵەکانمان و، سەرەتاش دڵنیا بین کە لە هەڵەو گوناهو خراپە خاڵیی نین: (كل بني آدم خطَّاءٌ، وخير الخطَّائين التَّوّابون) أخرجه الترمذي (٩٩٤٢)، وابن ماجه (١٥٢٤) وصححه الألباني. واتە: هەموو وەچەی ئادەم هەڵەکارن و، باشترین هەڵەکارانیش پەشێمانان و گەڕاوانن.

محمدی کوڕی کەعبی قورەیضی دەڵێ: (عن محمد بن كَعْب القُرَظِيِّ، قال: إذا أراد اللَّه تبارك وتعالَى بِعَبْدٍ خيراً، جعل فيه ثلاثَ خصالٍ: فقْهاً في الدِّينِ، وزَهَادةً في الدنيا، وبَصَّرَهُ بعيوبه) أخرجه ابن المبارك في «الزهد» ص: (٥٩-٦٩) رقم: (٢٨٢) ومن طريقه أبي نعيم في «حلية الأولياء» (٣/ ٣١٢).

واتە: خوا تبارك وتعالى هەرکات بەندەیەکی خۆشویست، سێ سیفەتی پێدەبەخشی: شارەزای دەکات لە دین و دنیا بەکەمگری دەکات و کەم و کوڕییەکانی خۆی پێشان دەدات.

هەڵبەتە دیتنەوەی کەم وکوڕیی و خراپەکانیشمان هەم بە خۆپشکنین و، هەم بەهەبوونی مامۆستاو چاوساغ و، هەم دۆست وبرایانی دڵسۆز ئەنجام دەدرێ، سەربارەش وەك (لقمان الحكيم) گوتوویەتی: بەپەندوەر گرتن لەهەڵەو پەڵەی خەڵکی خراپەکار!

**چوارەم: هەوڵدان بۆ کارلێك (تفاعل)ی زیاتر لەگەڵ قوڕئان دا:**

دەبێ هەوڵبدەین هەرچی زیاتر کارلێکی باشتر بکەین لەگەڵ قوڕئاندا، مامۆستایان ئەهلی قوڕئانن، ئایا چەند قوڕئان دەخوێنن ڕۆژانە؟! ئایا ویردێکی قوڕئانمان هەیە ڕۆژی جوزئێك، یان کەمتر، یان زیاتر؟، پاشان ئەو قوڕئانەی کە دەیخوێنین، چەندە بیری لێ دەکەینەوە و چەندەی لێ تێدەگەین؟! چونکە بەڕێز! بەئەندازەی ئەوە کە لە قوڕئان تێدەگەی، پێی کارتێکراو دەبی و لە بەرەکەت ونووڕەکەی بەهرەمەند دەبی، هەروەها کارلێککردنی زیاتر لەگەڵ ڕێ و شوێنی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ سوننەتەکانی، لەگەڵ ڕەوشتەکانی، لەگەڵ ئاکارەکانی، لەگەڵ هەڵوێستەکانیدا، یەکجار پێویستە، ئەگەر بمانەوێ بەسەر هەڵەو پەڵەو کەم وکوڕیی و خاڵە بێهێزەکان (نقاط الضُّعف)مان دا زاڵ بین، کە شەیتان و ناحەزانمان لەدرزو کەلێنی وانەوە زەفەرمان پێدەبەن!

**پێنجەم: خستنەڕووی ئیسلام بەپێی سروشتی بەرز و پاکی بەرزی ئیسلام نەك بەپێی میزاج و تەبعی خۆمان:**

بەڕێـــزان!

خوای پەروەردگار، قورئان پێناسە دەکات دەفەرموێ: ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾ التكوير -٢٧-.

واتە: ئەم (قورئان)ە، تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ جیهانییان.

کە ئەوە لەچەند جێیەکی دیکەش دا هاتوە، هەروەها خوای میهرەبان پێناسەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکات، دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ الأنبياء -١٠٧-.

واتە: تۆمان تەنیا بەبەزەیی بۆ تێکڕای جیهانییان ناردوە.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾سبأ -٢٨-.

پێغەمبەری ئێمە (صلى الله عليه وسلم) ڕەحمەتی خوایە بۆ هەموو جیهانییان، قورئانی ئێمە بیرخەرەوەیە و شەرەفە و ڕێز و حورمەتە بۆ هەموو جیهانییان، ئنجا ئێمەش دەبێ هەوڵبدەین لەقەدەر ئەو پێغەمبەرە (محمد) (صلى الله عليه وسلم) و، لەقەدەر ئەو قورئانە بین، ئێمەش دەبێ بیر لەهەموو خەڵکی بکەینەوەو، بشزانین کە ئەو قورئانە بۆ هەموو خەڵك نێردراوە، ئەو پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) ڕەحمەتە



بۆ هەموویان، ئنجا ئێمەش دەبێ هەوڵ بدەین: بەرجەستەکەری ئەو بیرخستنەوەیە بین، کە لە قورئاندا هەیە بۆ هەموو جیهانییان و، ئەو ڕەحمەتە بین کە لە پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) هەبووەو هەیە، بۆ هەموو جیهانییان، بێگومان لەقەدەر خۆمان.

بەڵێ زۆر گرنگە ئێمە بەپێی ئەو سروشت و شێوەیەی کە ئیسلام دەڵێ و، کە لە قورئان و سوونەتدا بەرجەستەیە، باسی ئیسلام بکەین، نەك ئەوەی کە خۆمان پێمان خۆشەو لەگەڵ میزاجمان دا دەگونجێ تێیدا گوڵبژێری بکەین!

**لەکۆتایی دا: قسەیەکیش بۆ خەڵك و جەماوەر:**

بەڕێزان! بێگومان ئیمام و ئوممەت پێکەوەن، وەك چۆن سەر و قالب پێکەوەن، سەر بەبێ جەستە و ئەندامەکانی هیچی لەدەست نایەت، ئیمامێك کە لەو میحرابەدا دەوەستێ پێشنوێژیی دەکات، ئەگەر مەئموومەکان لەپشتییەوە نەوەستن، هەربۆخۆشی ئیمامەتییەکەی بۆ ناکرێ و، ئیمام کەسێکە کە خەڵکی بەدواوەبێ، بۆیە بەڕاستیی مامۆستایان ئەوانەی کە ئەهلی مینبەر و میحرابن، لەپێش دا ئەوان دەبێ زۆر ئاگایان لە مەئموومەکانیان بێ، ئەوانەی کە لەپشتییانەوە دەوەستن، چونکە بەهۆی وانەوە ئیمام وپێشەوان، ئەگەرنا ئیمامی کێن؟ ئنجا ئەو خەڵکەش دەبێ بزانن بەئیمامەوە ئوممەتن، ئەگەرنا خەڵك ئیمامێکی نەبێ چی لێ دێ؟ وەك مەڕی بێ شوان، پرژ و بڵاو دەبێ و، وەك تەسبیحی دەزوو پساو هەردەنکەی دەچێتە شوێنێك، کەنگێ حیزبە سیکۆلاریستەکان، ئەو حیزبانەی بەرنامەیان غەیری قورئان و سوونەتە، کەی زەفەریان بە

خەڵك بردوە؟ دوای ئەوەی ئەو خەڵکە پرژو بڵاوبوون، دوای ئەوەی ئەو خەڵکە، ماموّستایەکان ئەهلیەتی ئەوەیان نەبوو ئیمامیان بن و، خەڵکەکە بگرنەوە، یاخود خەڵکەکە وازی لە ئیمامەکان هێنا، ئەوکاتە خەڵك بەدەم گورگی پیرو تاقمە دوور لەخوایەکانەوە چوون، (مەبەستم ئەو حیزبانەیە کە بەرنامەیان جگە لە قورئان و سوننەتە، بەڵکو دژو پێچەوانەی قورئان و سوننەتیشە)، بۆیە خەڵك و جەماوەریش دەبێ بزانێ ئیمامەکەی کێیە؟ پێشەوایەکەی کێیە؟ دەبێ ئاگای لێبێ و بەرگریی لێبکات و بی پارێزێت، ماموّستاش دەبێ بزانێ: بەوخەڵکەوە ئیمامەو ئەویش جارجار ئاوڕیان لێ بداتەوەو، چاوی لێیان بێ و، سەرپەرشتییان بکات و نەیەڵێ گورگ بیانبات.

خوا بەلوتف و کەرەمی خۆی یارمەتیی هەموولایەکمان بدات، وەك میراتگرانی پێغەمبەری کۆتایی (محمد) (صلی الله علیه وسلم) کە هەرچی زیاتر دڵسۆزبین بۆ خەڵك و بەخەمەوە بین بۆ خەڵك و جەماوەرو، هەرچی زیاتر مشوورخۆر بین، کە ئەویش بەوە دەبێت: هەرچی زیاتر ئیمانداربین و، بۆ خوا صوڵحاوبین، هەروەها پەیوەندییمان توندو تۆڵ بێ لەگەڵ خواداو، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)، بەتەئکید هەتا بەندەی چاکتر بین بۆ خواو، شوێنکەوتووی چاکتربین بۆ پێغەمبەری پێشەوا (صلی الله علیه وسلم)، دڵسۆزتریش دەبین بۆ خەڵکی خوا، خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ.

وَصلّى الله على محمد وَعلى آله وَصَحْبه أَجْمَعين،

والحمدُللهِ رَب العالمين

وتاری دووەم

هــــەولێر
٢٠١٩ / ١١ / ١٣

# چۆن شایستەی مینبەرو میحراب دەبین







https://youtu.be/IlL2c2eykLc







## پێشدەستیی

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على المبعوث رحمة للعالمين، نبينا محمد وعلى آله أجمعين والتابعين لهم بإحسان إلى يوم الدين من الصحب والأزواج والقرابة أجمعين

مامۆستایانی بەڕێزو سەنگین! هەموولایەك بەخێر بێن سەرچاومان، زۆر خۆشحاڵم کە ئەمشەو بەدیدارتان شاد بووم، خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی بەباشترین شێوە پاداشتان بداتەوە، بەهاتنتان باشترین پاداشتتان هەبێ و، مایەی زیاتر لەخوا نیزیك بوونەوەمان بێت.

مامۆستایانی بەڕێز!

بەندە وەك یەکێ لەخۆتان لەخزمەتتان دا قسەدەکەم، ڕەنگە هەندێکتان نەزانن کە من لەساڵی (١٩٨٣ز)دا -لەسەدەی پێشوودا- لەم شاری هەولێرە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتیی ئەوقافەوە، ئیجازەی مەلایەتییم وەرگرتووە، لە مزگەوتی (نۆرسیی)ش لەشاری ڕانیە تەعیین بووم، واتە: منیش مەلایەکم وەك ئێوەو لەخۆتانم.

بەڕێزان! ئەمشەو بابەتێکتان پێشکەش دەکەم بەناو و نیشانی: (چۆن شایستەی مینبەر و میحراب دەبین؟)، ئنجا ئەو بابەتە (بەرایی)یەکی هەیەو لە دوو تەوەر، پێك دێ:

تەوەری یەکەم: باسی ئەوە دەکەین: (بەئەندازەی ئەوە کە وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەچین، شایستەی مینبەر و میحراِبەکەشی دەبین).

تەوەری دووەم: بریتییە لەوەی: (چی بکەین، تاکو وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بچین؟).

# بـــەرایـــی

بەڕێزان! دەمەوێ تۆزێ پێناسەی ئەم بابەتە بکەین، ئایا مەبەستمان لەوە چییەکە دەڵێین: چۆن شایستەی مینبەر و میحڕابی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەبین؟

مامۆستایان! خۆتان دەزانن کە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) شتێك کە بۆ ئێمەی بەمیرات بەجێهێشتوە، بریتیە لەو وەحییەی، کە خوا (سبحانە وتعالى) وەك پەیامێك پێیدا ناردوە، بەو وەحییەش (محمد)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (عبدالمطلب) (صەڵات وسەلامی خوای لەسەر بێ)، لەخەڵکی دیکە جیابۆوەو بووە پێغەمبەری خوا (رسول الله)، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ﴾ الكهف -١١٠-.

واتە: بڵێ منیش هەر مرۆڤێکم وەك خۆتان، جیاوازییەکەم ئەوەیە وەحییم بۆ دێ، ئنجا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەوەی بۆ ئێمەی بە میرات جێهێشتوە، بریتیە لەو وەحیی و پەیامەی کە خوا بۆی ناردوە، کە بەپلەی یەکەم لە دووتوێی قورئاندایە، پاشان لە دووتوێی ڕێباز و ڕێ و شوێنی پێغەمبەردایە (صلى الله عليه وسلم)، ئنجا ئایا کوێ لە کۆمەڵگادا، ڕەمز و هێمای ئەو وەحیی و پەیامەیە؟ بێگومان مینبەر و میحڕاب، لەسەر مینبەر ئەو پەیام و وەحییەی خوا دەبێ بخوێنرێ و، بەگوێی خەڵکدا بدرێ و، لە میحڕابیشدا، دەبێ





پێشەوایەتیی (إمامة) بۆ خەڵك بکرێ، ئەوانەش هەردووکیان بریتیین لە جێنشینایەتیی و جێگرایەتیی پێغەمبەری خاتەم (محمد) (صلی الله علیه وسلم).

کەواتە: لە ڕاستییدا، ئەهلی مینبەر و میحراب، هەموو ئەوانەن کە بەشێوەیەك لە شێوەکان، دەیانەوێ لەسەر مینبەری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)و، لەنێو میحرابەکەیەوە، حەق بڵێن و پێشەوایەتیی خەڵك بکەن، بەڵام بەڕێیی پێغەمبەری خوا (رسول الله) (صلی الله علیه وسلم)دا، یانی: هەموو ئەوانەی بەشێوەیەك لەشێوەکان، هەوڵدەدەن خەڵك لەو دوو شوێنەوە -کە گوتمان هێما و ڕەمزی مسوڵمانەتیی و وەحیی خوان، هێما و ڕەمزی دیندارییین: مینبەر و میحراب- خەڵك وجەماوەر بدوێنن و بگێڕنەوە بۆ وەحیی، هەموو ئەوانە بە ئەهلی مینبەر و میحراب دادەنرێن، منیش ڕووم لەهەمووانە، بەجیاوازیی ڕەنگ و، بەرگ و پۆشاك و، ئینتیماو... هتدەوە، تێکڕای ئەوانەی خۆیان بە جێگر و میراتگری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەزانن، ڕووم لە هەموو ئەو بەڕێزانەیە.

ئنجا ئایا ئامانجم چییە لەپێشکەش کردنی بابەتەکەدا؟ دەتوانم بڵێم سێ ئامانج ومەبەستم هەن کە ئەم بابەتە پێکەشی مامۆستایان دەکەم:

١- دڵسۆزیی بۆ نواندنیان،

٢- بەرچاو ڕوونکردنەوەیان،

٣- بەرگریی لێ کردنیان.

ئنجا هەر لەم پێشەکییە کورتەدا بەچاکی دەزانم ئاماژەکیش بەدوو مەسەلان بکەم:

**یەکەم:** مامۆستایان و ئەهلی مینبەر و میحرابیش، مرۆڤن، وەك هەموو ئەو مرۆڤانە، بەڵام بەداخەوە لەوەهمی زۆر خەڵکدا وایە کە، مامۆستایان دەبێ مرۆڤ نەبن!!، مامۆستایان دەبێ لە سەرووی ئاستی بەشەرەوە بن،! بۆیە هەرکاتێك شتێك لەمامۆستایەك دەبینن، کە وەك هی خەڵکی ئاسایی بێ، بەشتێکی نامۆ دێتە بەرچاویان، کە ئەوە زوڵمێکە لە مامۆستایان دەکرێ، چونکە مامۆستایان و ئەهلی مینبەر و میحرابیش مرۆڤن، سەرماو گەرمایان دەبێ، ترس و تەماع کاریگەریی لەسەریان دەبێ، ئەوانیش چاکەو خراپەیان دەبێ، فریشتە نین، ئەو ئایەتە موبارەکەی کە لە سەرەتاوە خوێندرایەوە بەڵگەیە لەوبارەوە:

﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَـٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ ﴾ (الفاطر:٣٢).

واتە: دوایی کتێبی خۆمان دا بەو بەندانەمان کە هەڵمان بژاردوون، کەواتە: هەرکەسێك لە کتێبی خوا شارەزابێ، لە لای خواوە کەم و زۆر هەڵبژێردراوە، بەڵام دوایی پۆلێنیان دەکات، خوا (سبحانه وتعالى) خوا زانا و کار بەجێییە، دەزانێ چی دەفەرموێ، [فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ]، هەڵگرانی کتێبی خوا: هەیانە ستەمی لەخۆی کردوە، ستەم لە خۆی



دەکات، زانایانی تەفسیر دەڵێن: بۆیە خوای پەروەردگار ئەوانی پێش خستوە، چونکە ژمارەیان زیاترە!

[وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ ] هەشیانە میانجییە، زوڵمی لەخۆی نەکردوەو دوانەکەوتوە، بەڵام زۆریش پێش نەکەوتوە.

(وَمِنْهُمْ سَابِقُۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ )، هەشیانە لەچاکەکاندا پێش کەوتۆتەوە، لە پێشبڕکێدا پێشکەوتۆتەوە، کە ئەوەیان زۆر گرنگە، بۆیە زانایان دەڵێن: (ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ )، ئا ئەوەیە بەخششی گەورە، تەنیا بۆ هی سێیەمیان دەچێتەوە.

**دووەم:** کەسانێك هەن کە بەگشتیی ستەم لە ئەهلیی مینبەر و میحڕاب دەکەن، کە ئەو ستەمەش جۆرا و جۆرە:

١- جارێك لەبەر ئەوە ستەمیان لێ دەکەن، کە حەق دەڵێن لەسەر مینبەری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)! کە ئەو مینبەرە بۆخۆی شوێنی حەق لەسەر گوتنە!، یان لەو میحڕابەی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، دەیانەوێ ئیمامەتییەکی بەحەق بکەن! کە ئەو میحڕابە شوێنی ئیمامەتیی و پێشەوایەتیی مسوڵمانانە بەحەق!

٢- جاری واش هەیە زوڵمەکەیان بۆیە لێ دەکەن، چونکە بەهەوای ئەوان ناجووڵێنەوە، کە لەڕاستییدا هەرکەسێك بەهەوای حکومڕانی ستەمکار بجووڵێتەوە، مانای وایە لە (هُدی)ی پێغەمبەری خوا لایداوە، مرۆڤ یان دەبێ ئەهلی (هوی) بێ، یان ئەهلی (هُدی) بێ، ئنجا ئەگەر بەدوای هەوای خۆی، یان هی خەڵك بکەوێ، دیارە لە هیدایەت و ڕێبازی خوا و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لایداوە.

٣- جارێکی دیکەش ستەمەکە ئەوەیە کە: کەسانێکی ناشایستەی بەناو مەلاو زانا هەن، خزێنراونە سەر مینبەرەکان و نێو میحرابەکانەوە، بۆ مەبەستی سیاسیی، کە شایستەیی (كفاءة)یان نیە، بەڵام خزێنراونە سەر مینبەر و نێو میحرابەکانەوە، خۆشتان دەزانن بۆچی؟ تاکو بەهۆی ئەو جۆرە کەسانەوە، لەپێگەو پۆشاکی پێشەوایی دا، لە سەنگ و قورسایی مامۆستایانی ڕاستەقینە کەم بکەنەوە!!

بێگومان کەسانێکیش هەن -وەك پێشتریش ئاماژەمان پێیدا- کە مەرج نیە بەدەست نێرراین و دروستکراوبن، بەڵام وەك چۆن خەڵك گوناح و هەڵە دەکات و لادان و خلیسکانی تووش دێ، ئەوانیش کەم و کوڕییان دەبێ، کە ئەوەش شتێکی عەجایب نیەو، شتێکی چاوەڕوانکراوە.

# تەوەری یەکەم

## بەئەندازەی ئەوە کە وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، دەچین، شایستەی مینبەر و میحرابەکەی دەبین

مامۆستایانی بەڕێز!

هەرکەسێك لە شوێنی کەسێك دابنیشێ و، بیەوێ ئەو کارەبکات کە ئەو کردوویەتی، یان ئەو دەیکات، بە ئەندازەی ئەوە کە وەك وی دەچێ لەجۆری بیرکردنەوەو تێڕوانین، لەسیفەتەکانی، لە هەڵس و کەوتەکانی دا، دەتوانێ ئەرك و کاری ئەویش ڕاپەڕێنێ، ئنجا کە مینبەر و میحرابەکە هی پێغەمبەرن (صلی الله علیه وسلم)، ئێمە کاتێك شایستەی ئەو مینبەر و میحرابە دەبین، کە هەوڵ بدەین وەك پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) بچین، لەچییدا؟ لە چوار خاڵان دا باسی ئەوە دەکەین:

**یەکەم:** موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)، پێش ئەوەی خوا وەحیی بۆ بنێرێ، بەگشتیی وەك خەڵك دەژیا، بەڵێ لەهەموو خراپەیەك دوور بوو بەحوکمی زگماك (فطرة)ی پاکی وعەقڵی سەلیمی، بەڵام هەموو ئەو شتانەی لەڕێی وەحییەوە نەبێ نازانرێن، نەدەیزانین و، دوای ئەوەی خوا (سبحانه وتعالی) موشەڕڕەفی کرد بە وەحیی، موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا بوو بە (رسول الله)، (صلی الله علیه وسلم) و لە خەڵکی دیکە جیا بۆوە، هەموو پێغەمبەرانیش هەر وا بوون، هەر مرۆڤی ئاسایی بوون، بەڵام کە خوای پەروەردگار وەحیی بۆ ناردوون، بوونە مرۆڤێکی دیکە، کەواتە: ئێمەش بەوە شایستەی مینبەر و میحرابی پێغەمبەر دەبین (صلی الله علیه وسلم)، کە ئەوەی (محمد)ی کوڕی (عبدالله)ی پێ بۆتە (رسول الله) کە وەحیی خوایە، ئێمەش هەر بەدەستگرتن بەو وەحییەوە دەبینە شایستەی مینبەر و میحراب و، دەبینە جێگر و میراتگری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بەڵی بەدەستگرتن بەو وەحییە، بە تێگەیشتن لەو وەحییەو، پابەندیی بەو وەحییە، نەك بە عاتیفە و خۆزگە





خواستن و ناو ونیشان، چونکە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، بە وەحیی خوا بۆتە پێغەمبەری خوا (رسول الله)، ئنجا ئێمەش بە دەست گرتن بەو وەحییە، دەبینە شوێن کەوتووی پێغەمبەری خوا (رسول الله)و، دەبینە میراتگر و جێگری و، دەبینە شایستەی مینبەر و میحرابەکەشی، خوای بەرزو مەزن (سبحانه وتعالى)، ئەم ڕاستییەی لە دوو ئایەتدا لە قورئاندا هێناوە، لە ئایەتی ژمارە (١١٠) لە سوورەتی (الكهف)داو، لە ئایەتی ژمارە: (٦)یش لە سوورەتی (فصلت)داو، بە یەك تەعبیر:

﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾،

بەدڵنیاییەوە لە قورئان دا ئەوپەڕی وردەکاریی هەیەو، هەر ڕاستییەك لەیەك شوێن لە قورئاندا هاتبێ، تەواوە، بەڵام لە دوو شوێندا دووبارە بووبێتەوە، یان لە چەند شوێنێك دا، دیارە بایی ئەوەندە گرنگیی و بایەخی هەیە، خوا دەفەرموێ: {ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)} تۆ بڵێ: من تەنیا مرۆڤێکم وەك ئێوە، بەڵام وەحییم بۆ دێت، (ئنجا ئایا وەحییەکە نێوەڕۆکەکەی و هەناو و هەوێنەکەی چییە؟) [أَنَّمَآ إِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ]، کە پەرستراوی ئێوە (شایستەی پەرستران بێ)، یەکێکە.

ئەویش خوایە (سبحانه وتعالى) چونکە، هەمیشە لادانی بەشەر لەوەدابووە کە، هاوبەش وهاوتایان بۆ خوا داناوە، یان لە جیاتی خوا، شتی دیکەیان پەرستوە، ئێستاش وایە و لە ڕابردووشدا هەروا بووە.

**دووەم:** ئایا وەحیی خوا (سبحانه وتعالى)، ئەو وەحییە کە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا (ڕووحمان فیدای بێ)، پێی بۆتە پێغەمبەری خوا (رسول

الله) (صلی الله علیه وسلم)و بۆتە هۆکاری ئەوە کە فەرمانبەریی بۆ کرانی پێویست بێ لەسەر هەر مرۆڤێك، ئەو وەحییە لەچیدا بەرجەستەیە؟ بێگومان لە قورئاندا بەرجەستەیە بەپلەی یەکەم و، پاشان لە ڕێباز (سنة)ی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)دا، وەك خوا تبارك وتعالی لە سووڕەتی: (الشوری:٥٢) دەفەرموێ:

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَـٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَـٰنُ وَلَـٰكِن جَعَلْنَـٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ ﴾.

خوا (سبحانه وتعالی) پێشێ لەئایەتی ژمارە (٥١)دا باسی ناردنی وەحیی دەکات:

﴿ ۞ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِىَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾.

دوایی دەفەرموێ: [وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ]، واتە: وەك چۆن وەحییمان ناردوە، بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ (ئەی موحەممەد! (صلی الله علیه وسلم)) هەر بەو شێوەیەش ڕووحێکمان لەلایەن خۆمانەوە بۆ تۆ ناردوە، (خوا وەحیی خۆی بە ڕووح ناو دەبا.) [مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَـٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَـٰنُ] پێش ئەوەی ئەو ڕووحەت بۆ بێت، (ئەی موحەممەد! (صلی الله علیه وسلم)) نەتدەزانی نە کتێب (بەرنامە) چییە و، نە ئیمان چییە! [وَلَـٰكِن جَعَلْنَـٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ] بەڵام ئێمە ئەو قورئانە و ئەو ڕووحەمان کردە ڕۆشناییەك،

ئەوەی بمانەوەێ لەبەندەکانمان پێی دەخەینە سەر ڕێی ڕاست و، بەدڵنیاییی تۆش (خەڵك) بەرەو ڕاستەڕێ ڕێنمایی دەکەی.

کەواتە: مامۆستایان! وەحیی خوا لە فەرمایشتی خوادا بەرجەستەیە، ئەدی ئایا ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەکوێی وەحیی خوا دایە؟

لەسووڕەتی (الحشر: ٧)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ ...وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ۝٧ ﴾،

واتە: ئەوەی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم)، پێتان دەدا، لێی وەربگرن و، ئەوەی لێتان قەدەغە دەکات، خۆتانی لێ دووربگرن و، پارێز لەخوا بکەن، بێگومان خوا سزا و تۆڵەی توندە، واتە: نەچن سەرپێچیی لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکەن! بەڵێ ئەوەی پێغەمبەریش پێمان دەدات، هەر ئەوەیە کە خوا پێی داوین، پێشێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قورئانی پێداوین و، دواییش جۆرێك لە وەحیی دیکەی پێداوین، کە خوا (سبحانه وتعالى ) جگە لە قورئان بۆی ناردوە، وەك لە فەرمایشتێکی دا دەفەرموێ: (أَلَا إِنِّي أُوتِيتُ الْكِتَابَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ...) رواه أبو داود: ٤٦٠٦، وصححه الألباني، واتە: ئاگاداربن! من قورئانیشم پێدراوەو وێنەی ئەویشم پێدراوە، هیچ گومانی تێدا نیە کە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) جگە لە قورئان خوای پەروەردگار وەحیی دیکەشی بۆ ناردوە، ئەوەش یەکێك لەو شتانەیە، کە لەنێو ئەهلی ئیسلامدا و، لەنێو زانایانی ئیسلامدا، مشت و مڕی لەسەر نیە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ﴿٦٩﴾﴾ (النساء:٦٩).

واتە: هەرکەسێك فەرمانبەریی خوا و پێغەمبەر بکات (فەرمانبەریی خوا بە شوێنکەوتنی قورئان و، فەرمانبەری پێغەمبەریش بەگرتنی ڕێبازەکەی)، ئەوە لەگەڵ ئەوانەدایە کە خوا چاکەی لەگەڵدا کردوون لەپێغەمبەران و صیددیقان وشەهیدان وچاکان، ئەوانەش چاکترین هاودڵن.

**سێیەم:** سوننەت (یانی: ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم))، نەك لە قورئان جیا نیە، بەڵکو کاکڵ و جەوهەری سوننەت بریتیە لە قورئان، هەناو و هەوێنی سوننەت بریتیە لە قورئان، بۆچی؟ چونکە سوننەت واتە: ڕێباز (سنة النبي) یانی: (طريقة النبي) ڕێبازو ڕێ و شوێنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئنجا زانایان بەسێ جۆر پێناسەی سوننەتییان کردوە:

١- **فەرمووودەناسان** (مُحَدِّثون) گوتوویانە: سوننەت بریتیە لە هەر شتێك لە فەرمایشت و کردەوە و دانپێداهێنان (قول وفعل وتقرير) کە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئێمە هاتوە.

٢- **شەرعزانان** (الفقهاء) وشەی (سنة)یان بەکارهێناوە، بە واتای پەسند (الندب) لە بەرانبەر پێویست (واجب).

٣- **زانایانی** (أصول الفقه) وشەی (سنة)یان بەکارهێناوە، بۆ ئەو حوکمە شەرعییانەی کە لە ڕێی غەیری قورئانەوە چەسپاون، واتە: لە ڕێی



ئەو وەحییەوە کە بەجیا بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاتوە، جگە لە قورئان.

**٤- پێناسەی بەندە بۆ (سنة):** پێموایە، ئەگەر پێناسەی سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئاوا بکەین، ئەوە هەرسێك پێناسەکە دەگرێتە خۆی و، ڕام وایە ئەو پێناسەیە بۆ (سنة) تەواوترە کە بڵێین: {سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) یانی: ئەو ڕێبازەی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گرتوویەتە بەر لە دینداریدا، کە بناغەکەی بریتیە لە قورئان و سوننەت، چۆنیەتی جێبەجێکردنی قورئانە}.

ئنجا لە ڕاستییدا ئەوەی کە خوای بێ وێنەو هاوتا لە سوورەتی (النحل) دا ئایەتی (٤٤)دا دەفەرموێ:

﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾

واتە: ئێمە زیکرمان بۆ لای تۆ دابەزاندوە، تاکو ئەوەی بۆ لای خەڵکی دابەزێنراوە، بۆیان ڕوون بکەیەوەو، تاکو بۆخۆشیان بیربکەنەوە.

هەرچەندە زۆربەی زۆری توێژەرەوانی قورئان، ڕوونکەرەوانی ماناکانی قورئان (المفسّرون)، گوتوویانە: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەرکەکەی بریتیی بووە، لە ڕوونکردنەوەی قورئان، بەڵام ئەوە ڕاست نیەو، ئەرکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بریتی بووە، لە ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی جێبەجێکردنی قورئان، ئەگەرنا قورئان بۆ خۆی ڕوون و ڕوونکەرەوەیە:

﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْقُرْءَانِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ ①﴾ (النمل: ١).

﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ㉒﴾ (القمر: ٢٢).

قورئان هەم ڕۆشنە، هەم ڕوونکەرەوەیە، چونکە (مُبین) ئەگەر لە (أَبانَ)ی (لازم)ەوە هاتبێ، یانی: ڕوون، وەك: (أبان القَمَرُ) مانگ دەرکەوت، بەڵام ئەگەر لە (أبان)ی (متعدِّي)یەوە هاتبێ، یانی: ڕۆشنکەرەوە، وەك: (آبانت الشمسُ الأرضَ) خۆر زەوی ڕۆشن کردەوە، بەڵام ئایا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کوێی قورئان ڕۆشن دەکاتەوە؟ بێگومان چۆنیەتی کارپێکردنەکەی، ئەگەرنا قورئان خۆی بەشێوەی تیۆریی (نظري) ڕوونە، بەڵام ئەو شتانەی لایەنی کردەیی وپراکتیزەیی (تطبيقي)یان هەیە، پێویستییان بە ڕوونکردنەوەیە.

گێڕراوەتەوە: یەکێك لە خەواریج بە یەکێك لە هاوەڵانی گوت: ئێمە قورئانمان لەبەردەستدا بێت پێویستیمان بەهیچی دیکە نیە! هاوەڵەکە - کە بەتەمەن بوو - گوتی: ڕۆڵە! ئەو قسەیەت لەکوێ هێناوە؟ ئەدی ئێمە چۆن بزانین نوێژی نیوەڕۆ چەند ڕکاتە و، نوێژەکانی دیکە یەکی چەند ڕکاتن؟! هەروەها نوێژی نیوەڕۆ و عەسر بەبێ دەنگیی (سرِّي) دەخوێنرێن و ئەوانی دیکە: بەیانیی وشێوان وخەوتنان، بەدەنگی بەرز (جهري)و، ئەوەندە ڕکاتەن؟ هەروەها زەکات و حەج و ڕۆژو و؟ لەڕاستییدا پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، ڕوونکەرەوەی کارپێکردنی قورئان بووە، ئەگەرنا قورئان بۆ





خۆی ڕۆشنە، بەڵام بێگومان ئەویش بۆ ئەهلی خۆی[1]، ئەگەرنا[2]، ئێمە ئێستا (التفسیر النبوي للقرآن الکریم)مان لەبەر دەستدا دەبوو! بەڵام کوان ئەو ئایەتانەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ڕوونی کردوونەوە؟ بەژمارەی پەنجەکانی هەردووك دەست، یاخود شتێك زیاتر، دەژمێردرێن، بۆچی؟ چونکە، قورئان ڕۆشنە، بەڵام بۆ ئەهلی خۆی کە زمانی عەرەبیی بزانێ.

کەواتە: ئەو مشت و مڕەی هەیە، لەنێوان ئەوانەدا کە، سەرلێشێواون و، دەڵێن: ئێمە ئیکتیفا دەکەین بە قورئان، بەرانبەرەکانیشیان - کە زۆر جار تێپەڕاندن هەیە، لەهەردووك لاوە - بەپێی ئەو پێناسەی ئێمە هێنامان و ئەو ڕوونکردنەوەی باسمانکرد، پاساوی نامێنێ.

ئنجا بەدڵنیاییی هەر خۆی قورئان مولزەممان دەکات بەوەوە کە بەدوای پێغەمبەری خاتەم (محمد) (صلی الله علیه وسلم) بکەوین و، هەرچی ئەو پێمان دەدات بەفەرمان و قەدەغەوە (أمراً وَنهیاً) پێوەی پابەند بین، قورئان بەڕوون وڕاشکاویی دەفەرموێ: هەرکەسێ فەرمانبەریی خوا و پێغەمبەرەکەی بکات، مسۆگەر لەگەڵ ئەوانەدایە کە خوا چاکەی لەگەڵ کردوون، لە پێغەمبەران و صیددیقان و شەهیدان و چاکان.

ئنجا ئەگەر شوێنکەوتنی خوای پەروەردگارو فەرمانبەریی بۆ خوا، بەهۆی قورئانەوەیە، بێگومان: فەرمانبەریی پێغەمبەری خواش

---

(١) واتە کەسانێك شارەزای زمانی عەرەبیی بن، بەهەموو لق وپۆپەکانیەوە.

(٢) واتە: ئەگەر قورئان ڕۆشن و ڕوونکەرەوە نەبووایە..

(صلى الله عليه وسلم)، بەهۆی ڕێبازەکەیەوەیەو، لەڕاستییدا: ڕێبازی پێغەمبەر (محمد) (صلى الله عليه وسلم)، بریتیە: لە بەرجەستەکردنی قورئان لەسەر ئەرزی واقیع، لەژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم)و کۆمەڵگایەکەی دا، لەهاوەڵانی بڕواداری بەپیاوو ژن و وردو درشتەوە خوا لێیان ڕازی بێ.

**چوارەم:** وەحیی و پەیامی خوا، دوو پێکهاتەی سەرەکیی هەن، کە بریتین لە (الهُدى ودين الحق)، ئەم ڕاستییە لە سێ شوێن، لە قورئاندا هاتوە:

١- سوورەتی (التوبە: ٣٣).

٢- سوورەتی (الفتح: ٢٨).

٣- سوورەتی (الصف: ٩).

[ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ ]، لە دوو شوێنان دا دەفەرموێ: [لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ]، لە شوێنێك دەفەرموێ: [وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ]، خوا پێغەمبەری خۆی ناردوە بەڕێنمایی (هُدى)و بەبەرنامەی ڕاست (دين الحق)یشەوە، ئەو دوو شتە دەبێ لێك جیابن، (هُدى) بەتاك وەردەگیرێ، مرۆڤەکان تاك تاك دەبێ خاوەنی (هُدى) بن، ئنجا (هُدى) بەر لەهەموو شتێك لە بوونناسیی (معرفة الوجود - Ontology)دا خۆی دەنوێنێ، کە مرۆڤ بزانێت ئەم گەردوونە خاوەنی کێیەو، لەکوێ هاتوەو، بۆ کوێ دەچێ، سەروو خواری: ئاسمان و زەوی، پاشان مرۆڤ پێگەی لەگەردوون دا چییە؟!



ژیانی دنیا چییە؟! دوارۆژ چییە؟!، ئەو پرسیارە وجوودییانەی کە فەلسەفە زۆری خۆ ماندوو کردوە وەڵامیان بداتەوە، بەڵام خوا (سبحانە وتعالی) بۆی خستووینە دووتوێی چەند ئایەتێکەوە، ئائەوە بەشی یەکەم و بناغەی ئەو هیدایەتەیە، ئەو ڕێنماییەیە کە پێغەمبەری خاتەم (محمد) (صلی اللە علیە وسلم) هێناویەتی، بەشی دووەمی ئەو هیدایەتە، بریتیە لە ئیمان و عەقیدە، ئەوە کە ئینسان هەڵوێستی لە بەرانبەر خوادا (سبحانە وتعالی)، لەبەرانبەر فریشتەکانی، کتێبەکانی، پێغەمبەرانی، ڕۆژی دوایی، قەدەردا، چۆنبێ؟ ئەوە شەش پایەکانی ئیمان.

پێکهاتەی دووەمی وەحیی و پەیامی خوا، بریتیە لە بەرنامەی هەق (دین الحق)، وشەی دین لە زمانی عەرەبییداو لەبەکارهێنانی قورئاندا، هەرچەندە بەچەند واتایەك بەکار هاتوە، بەڵام لەم سیاقەداو لە چەند سیاقێکی دیکەدا، بەمانای بەرنامەی ژیانە.

بەڵێ مامۆستایانی بەڕێز!

ئەو ئیسلام و پەیامەی خوا، کە پێغەمبەری خاتەم (صلی اللە علیە وسلم)، بۆی بە میرات بەجێ هێشتووین، تەنیا هیدایەتێك نیە، تاکەکان هەڵیبگرن، کە بەداخەوە ئێستا زۆربەی مسوڵمانان هەر وان، نەك تەنیا لەنێو میللەتی کورددا، بەڵکو لەنێو زۆربەی مسوڵمانانی دنیادا، ئیسلام تەنیا هیدایەتە تاکییەکەی لێ ماوەتەوە، بەڵام ئیسلام وێڕای ئەوە، دینێکی حەق و ڕاستیشە، کە کارو باری تاکەکان، خێزانەکان، کۆمەڵگایەکان، لەڕووی ئابووریی، سیاسیی، کۆمەڵایەتیی...هتدەوە

ڕێکدەخات، بەرنامەی حەق ئەوەیە، جێی سەرنجە: خوای پەروەردگار لە باسی هیدایەتەکەدا نافەرموێ: تاکو زاڵی بکات و سەری بخات، بەڵام لەباسی دینە حەقەکەدا، دەفەرموێ:

﴿وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ﴾، (التوبة:٣٣)

واتە: ئەو دینە حەقە هاتوە، کە هەموو دین و بەرنامەکانی دیکە، بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، نەك زوڵمیان لێ بکات، بەڵام دەبێ دەستی دینی حەق، ئاڵا و بەیداغی دینی حەق، لەسەرەوەبێ، بەتایبەتی لەنێو خەڵکێکی مسوڵمان دا، نابێ سیکۆلاریزم و لیبرالیزم و سوسیالیزم و شرۆشاڵاتی دیکە باڵادەست بێ و، مسوڵمانان بەدوای بکەون، بەشێك لەوانەش کە خۆیان بە میراتگری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەزانن، ڕیشی خۆیان لەدەست کەسانێك بنێن، کە بەڕێی غەیری پێغەمبەریاندا دەبەن، چۆن وا دەبێ! ئەدی کوا هیدایەتەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، هێناویەتی! ئەدی کوا دینە حەقەکەی هێناویەتی! کە خوا لە سێ شوێنان، لە قورئان دا دەفەرموێ: بەرنامەی ڕاست (دین الحق)ە، بۆ ئەوەشە کە بەسەر هەموو بەرنامەکاندا زاڵبێ، بەتایبەت لەنێو مسوڵماناندا.





مامۆستایانی بەڕێز!

ئەوەی دەیڵێم هەمووی بیرخستنەوەیە بۆ ئێوە و بەرچاو ڕوونییە و، هەوڵیشمداوە، بەغەیری ئایەت و فەرموودە قسەنەکەم، چونکە دین (ئیسلام) ئەوەیە کە خوا و پێغەمبەری خوا فەرموویانە، ئنجا من پێموایە دەبێ سێ کاران بکەین:

**یەکەم:** باش لە کتێبی خوا تێگەیشتن و تێدا پێگەیشتنی.

**دووەم:** موو بەموو بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پابەندبوون.

**سێیەم:** وریابوون لە ژمارەیەك هەڵەو پەڵەو لادان وخلیسکان.

**١ـ باش لە کتێبی خوا تێگەیشتن و تێدا پێگەیشتنی.**

بەڕێـــزان!

جێنشینایەتیی کردنی پێغەمبەر و، ئەهلی مینبەر و میحراب بوون، بەبێ شارەزایی لە قورئان دا، هیچ مەعنایەکی نیە، دەشزانم کەم و زۆر هەمووتان ئەهلی قورئانن، بەڵام وەك برایەکی دڵسۆزی خۆتان بەبیر خۆشم وئێوەشی دەخەمەوە: کە ئێمە لەگەڵ قورئان دا باش کارلێکمان نەکردوە و وەك پێویست لە خزمەتیدا نەبووین، چونکە ئەگەر تەماشای سیرەی پێغەمبەری خاتەم (محمد) (صلی الله علیه وسلم) بکەین: وهەموو ژیانی بریتی بووە، لە کارلێککردن (تفاعل) لەگەڵ



قورئان دا، جارێ هەموو هەڵس و کەوتی ڕۆژانەی بریتی بووە لەوەی قورئان چی فەرمووە، وایکردوە، پاشان شەوانە هاوسەرە بەڕێزەکانی بەتایبەت، دایکمان (عائیشە) خوا لێی ڕازیی بێ و، هاوەڵانی کە زۆر لێی نزیك بوون، دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە نوێژەکانی شەو و ڕۆژی دا، بەردەوام قورئانی خوێندوە، بەڵام چ قورئان خوێندنێك! بەتایبەت لە نوێژی بەیانی دا:

﴿إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾﴾ (الإسراء:٧٨)

هەروەها لە شەو ونوێژدا: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ ﴾ (الإسراء:٧٩)، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، شەوەکەی بەزۆریی لەخزمەت قورئاندا بەسەر بردوە، ئنجا لەبەر ئەوەی بەشەوێ باش لە خزمەت فەرمایشتی خوا (کلام الله)دا بووە، بەڕۆژیش باش توانیویەتی، ڕەنێوی بێنێ و کاری پێبکات، وەك خوا عزوجل دەفەرموێ:

﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ﴾ (الأنعام:١٢٢).

واتە: ئایا کەسێك کە مردوو بوو ژیاندمانەوەو ڕووناکییەکمان پێدا کە لەنێو خەڵکی دا پێی بڕوا، وەك کەسێکە کە لە تاریکاییان دایە لێیان دەرباز نابێ!

بەڵێ ئەو کتێبی خوا (کتاب الله)یە کە لەبەر دەستماندایە، ئەو قورئانە مەزنە، ئەگەر تەماشای پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) بکەین، کە ئێمە پێمان خۆشە پێمان بڵێن: میراتگر و جێگری وی (إن

شاءالله) هەرواشین کەم و زۆر، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، تەمەنەکەی هەموو بریتیی بووە لە ژیان لەگەڵ قورئان، با سەرنج بدەین خوای زاناو توانا لەبارەی قورئانەوە چی فەرمووە؟ چوار ئایەت و چوار فەرموودە، لەوبارەوە بەنموونە دێنینەوە:

**یەکەم: چوار نموونە لە ئایەتەکانی قورئان لەبارەی قورئانەوە:**

١- هەردووك ئایەتی (١٥و١٦)ی سوورەتی (المائدة):

خوا دەفەرموێ: ﴿قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ ۚ قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٦﴾﴾، بڕواننە ئەو هەموو بەرەکەتە!

واتە: بە دڵنیاییەوە لە خواوە، (لە خاوەنی گەردوونەوە) ڕووناکیی و کتێبێکی ڕوون و ڕۆشنکەرەوەتان بۆ هاتوە، [ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ ]، خوا بەو کتێبە، هەرکەسێك بەدوای ڕەزامەندیی وی بکەوێ، دەیخاتە سەر ڕاستە شەقامی سەلامەتیی، [وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ]، هەروەها لە تاریکاییەکان دەریان دەهێنێ، بەرە و ڕۆشنایی:

أ- لە تاریکایی ئیلحادو کوفر و شیرك، بەرە و ڕۆشنایی خواناسیی و ئیمان و تەنیا خوا پەرستیی.



ب- لە تاریکایی زوڵم و ستەم و بێدادیی و چینایەتیی و قڕ و پڕیی، بۆ ڕۆشنایی عەدالەت و تەبایی و، پێکەوە ڕێك بوون.

ج- لە تاریکایی داڕووخانی ڕەوشت و ئەدەب و بەهایەکان، بەرەو ڕۆشنایی ڕەوشتی بەرز و ئەدەب وبەها بەرزەکان.

د- لە تاریکایی پەرتەوازەیی و شمشێر و خەنجەر لێکدی هەڵکێشان، بەرەو ڕۆشنایی یەکڕیزیی و برایەتیی و تەبایی.

هـ- لە تاریکایی بوونە ملۆزمی هەندێك لە نەتەوە و دەوڵەتان بەسەر هەندێکیان دا - وەك ئێستای زلهێزان و گەل و کۆمەڵگا چەوساوەکان - بەرەو ڕۆشنایی تەبایی و ڕێز لە یەکدی گرتنی نەتەوەکان.

ئەم کتێبە هاتوە خەڵك لەهەموو ئەو جۆرە تاریکاییانە دەربێنێ، بەرەو ڕۆشناییان بێنێ بەمانای فراوان و فرەڕەهەندی ڕۆشنایی:

بووناسیی و ئیمان و تەنیا خواپەرستیی و زانیاریی و دادگەریی و ڕەوشتبەرزیی ویەکڕیزیی وتەبایی وڕێزی یەکدی گرتن...

(وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ)، ڕێنماییان دەکات بۆ ڕاستە ڕێ و، ڕاستە شەقام.

٢- ئایەتی (٢٣) لە سوورەتی (الزمر)دا: ئەم ئایەتە بەپێزە زۆر سەرنجی منی ڕاکێشاوە، بێگومان بۆ مامۆستایانی بەڕێزیش هەروایە، تەنیا یەك ئایەتە، بەڵام خوای زاناو توانا دە (١٠) وەسفی قورئانی بەپێزی تێدا خستوونەڕوو[1]:

---

(١) دە (١٠) وەسفەکان بەم جۆرەن:

﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٍ ﴿٢٣﴾﴾

مامۆستای بەڕێز! ئەو ئایەتە کە دەخوێنیەوە، وەك ئاوێنە لە بەرانبەر خۆتی ڕابگرە، تێی دەگەی تۆ لە کوێی ئەو قورئانەی و، چەند لە قورئان بەهرەمەند بووی! خوا دەفەرموێ: خوا باشترین فەرمایشتی پلەپلە دابەزاندوە، [كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ] کتێبێکە، ئایەتەکان و ڕاستییەکانی وەك یەك دەچن و دووبارە دەبنەوە، [تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ]، ئەوانەی هەیبەت و سامی پەروەردگاریان لەدڵدا هەیە، بەهۆیەوە پێستیان تەزووی پێدادێ، موچوڕکی پێدادێ، {(إقشعرار)، یانی: موچوڕکە پێداهاتن} [ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ]، دوایی وردە وردە دڵیان و پێستیشیان نەرم دەبێ بەرەو یادی خوا، ئا ئەوە ئەو هیدایەتەی خوایە، کە ئەوەی بیەوێ پێی ڕاستەڕێ دەکات...

سەلەفی ساڵحی ئێمە چۆن بوون؟ یەکێ لە تابیعین لە یەکێ لە هاوەڵان دەپرسێ: بۆم باسبکە هاوەڵانی پێغەمبەر کە تۆ لەگەڵیان بووی، لەگەڵ قورئان دا چۆن بوون؟ دەڵێ: کە قورئانیان دەخوێند، فرمێسکیان بە چاو دادەهات، موچوڕکەیان پێدا دەهات و دەگریان و هەنسکیان دەهات!

---

١- ألله ٢- نزّل ٣- أحسن الحديث ٤- كِتاباً ٥- متشابهاً ٦- مثاني ٧- تقشعِرُّ منه جلود الذين يخشون ربّهم ٨- ثم تَلين جلودهم وقلوبهم ٩- إلى ذكر الله ١٠- ذلك هدى الله يهدي به من يشاءُ...



هەڵبەتە مەرج نیە هەموو كاتێك، بەڵام، دەبێ جاروباریش موچوڕكەو تەزوومان بە دڵدابێ و، فرمێسكمان بەچاودابێ، لەگەڵ خوێندن و گوێبیست بوونی فەرمایشتی خوادا، وەك لە سوورەتی (الإسراء: ١٠٩) دا خوای میهرەبان باس دەكات دەفەرموێ: [يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا]، دەگرین و خشووعیان زیاد دەكات، لەحاڵێك دا كە قورئان دەخوێنن، یان دەبیستن.

٣- خوای پەروەردگار لە سوورەتی (ص: ٢٩)دا ئاوا پێناسەی قورئان دەكات:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾،

واتە: ئەمە كتێبێكە، بۆلای تۆمان دابەزاندوە، پڕ پیت و پێز و بەرەكەتەو بەرهەمدارە، تاكو لە ئایەتەكانی ورد ببنەوەو، خاوەن عەقڵان پەندی لێوەربگرن.

٤- ئایەتی (٣١) لە سوورەتی (الرعد)دا:

﴿ وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ ۗ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا ۗ أَفَلَمْ يَا۟يْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ﴾،

واتە: ئەگەر قورئانێك هەبووایە چیاكانی پێ ڕۆێندرابان، (لاچوێندرابان لە شوێنی خۆیان) و زەوی پێ بڕدرابایەو، قسەی پێ لەگەڵ مردووان دا بكرابایە، (ئەم قورئانە دەبوو)....

مەبەستم ئەوەیە ئەم قورئانە مەزنە ئەوەندە دەهێنێ، کە مرۆڤ - بەتایبەت بابای زاناو پێشەوا - بەشێکی زۆری کات وتەمەنی خۆی بۆ خوێندن و لێتێگەیشتن وتێوەڕامانی تەرخان بکات، چونکە لە ڕاستییدا لە وجووددا هیچ شتێکی دیکە نیە بەقەدەر قورئان گرنگیی و بایەخ و بەهای هەبێ و، شایستەی ئەوە بێ مرۆڤ کاتی لەگەڵ سەرف بکات، بەڵێ قورئان ئەوەندە دەهێنێ، کە هەموو یان لانی کەم بەشێکی زۆری ژیانی لەگەڵ بەرینە سەرو، لێی ورد بینەوەو، لێی بەهرەمەند بین و، لێی تێ بگەین و، تێیدا پێ بگەین.

**دووەم: چوار نموونە لە دەقەکانی سوننەت لەبارەی قورئانەوە:**

١- (عَنْ حُذيفَة، فَقُلْتُ: يا رسولَ الله! فَمَا تَأْمُرُنِي إِنْ أَدْرَكْتُ ذَلِكَ؟ قَالَ : تَعلَّم كِتَابَ اللهِ وَاعمَل بِهِ، فَهُوَ النَّجاة) أخرجه الحاكم: ٨٣٣٠ وقال صحيح الإسناد، وأحمد: ٢٣٣٣٠، والنسائي في الكبرى: ٨٠٣٣، والطيالسي: ٤٤٢.

ئەم فەرموودەیە لەدرێژەی فەرمایشتێکدایە، حوزەیفەی کوڕی یەمان لەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەپرسێ و دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەگەر بەو ڕۆژگارە گەیشتم چی بکەم؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: کتێبی خوا فێربەو، کاری پێبکە، ئەوە ڕێی دەرباز بوونە.

یانی: ڕێی دەربازبوون نیە لەو ئاشووب و ئاژاوانەی بەرەو ڕووتان دێن، جگە لە کتێبی خوا.





٢- (عَنْ عَلِيّ ، قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ : كِتَابُ اللهِ فِيهِ خَبَرُ مَا قَبْلَكُمْ، وَنَبَأُ مَا بَعْدَكُمْ، وَحُكْمُ مَا بَيْنَكُمْ ، هُوَ الْفَصْلُ لَيْسَ بِالْهَزْلِ) أخرجه ابن أبي شيبة: ٣٠٦٣٠.

واتە: گوێم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو کە دەیفەرموو: کتێبی خوای بەرز، هەواڵی پێش ئێوەی تێدایەو، هەواڵی داهاتووتان پێڕادەگەیەنێ و، دادوەریی ئەو کێشانەی دەکەونە نێوانتانەوە تێیدایەو، قورئان یەکلاییکەرەوەیەو، گاڵتەی تێدانیە.

٣- فەرموودەیەکی دیکە کە زۆر جێگای دڵخۆشییە بۆ هەموومان، دەفەرموێ: (أبشروا فإن هذا القرآن طَرَفُهُ بيد الله، و طَرَفُهُ بأيديكم، فتمسَّكوا به، فإنكم لن تهلكوا و لن تضلوا بعده أبداً) أخرجه الطبراني في الصغير: ١٠٤٤، وصحَّحه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: ٣٤.

واتە: دڵخۆشبن ئەم قورئانە لایەکی بەدەستی خواوەیەو، لایەکەی دیکەی لەدەستی ئێوەدایە، (وەك چۆن گوریسێك سەرێکی بەدەستی کەسێکەوەبێ و، سەرێکیشی بەدەستی یەکی دیکەوەبێ ) دەجا توند دەستی تێبگرن ودڵنیاش بن هەتا دەستتان پێیەوەبێ، نافەوتێن و هەرگیزیش دوای وی - دوای دەست پێوەگرتنی- گومڕاو سەرگەردان نابن.

٤- فەرموودەیەکی دیکە: (إِنَّ اللهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الكِتَابِ أَقْوَاماً وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ)، أخرجه أحمد: ٢٣٢، ومسلم: ٨١٧، وابن ماجه: ٢١٨، وأبو عوانة: ٣٧٦٢، وابن حبان: ٧٧٢.

واتە: بەدڵنیایی خوا بەم کتێبە (کە قورئانە) کەسانێك بەرز دەکاتەوە و، کەسانێکیشی پێ نزم دەکات.

قورئان چۆن خەڵك نزم دەکات؟ ئەوانەی دژایەتیی قورئان دەکەن و، پشت لە قورئان دەکەن، لەدنیاو قیامەت دا نزم دەبنەوەو، سەرشۆڕیی و عەیبدارییان بۆ دەمێنێتەوە، تەماشای مێژوو بکەن: (ئەبوو جەهل و، نەضری کوڕی حاریث و، وەلیدی کوڕی موغیرەو، ئومەییەی کوڕی خەڵەف و... هتد) ئەوانەی زلە زلەکانی قورەیش بوون و، دژایەتیی قورئانیان کرد، ئێستا چوونە کوێ؟ هەروەها ڕەش و ڕووتەکانی وەك: (بیلال و، صوهەیب و، سەلمان و، ئەبووزەڕو، ...هتد) چوونە کوێ؟ ئەمان سەریان بەرز بوو، گەیشتە کەهکەشانی فەلەك و، ئەوانی دیکەش، فڕێدرانە زبڵدانی مێژوو، ئەوە لەڕابردوودا، ئێستاش هەروایە.





**٢- موو بەموو بە ڕێبـــازی پێغەمـــبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پابەندبوون:**

بەڵێ بەڕێـــزان!

ئەگەر دەمانەوێ وەك پێغەمبەری خوا بچین، دەبێ لە خزمەت قورئاندا بین، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، هەر لەخزمەت قورئاندا بووە، ئیدی هەموو شتەکانی دیکەی سوننەت بوو، ڕۆژێك گەنجێك پرسیاری لێ کردم گوتی: مامۆستا! تێبینییەکم هەیە لەسەر وتارەکانی تۆ!

گوتم فەرموو.

گوتی: کە وتاری سیاسیی دەدەی، وتارەکەت سیاسیی نیە، وتاری دینییە!

گوتم: بێ زەحمەت دەتوانی پێناسەی وتاری دینیی و وتاری سیاسییم بۆ بکەی؟

گوتی بەڵێ: وتاری سیاسیی ئەوەیە ئایەت و حەدیسی تێدانەبێ و، وتاری دینییش هەمووی بەئایەت و فەرموودەیە.

گوتم: ئایا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سیاسیی بووە یان نا؟

گوتی با!

گوتم: وتارەکانی چۆن بوون؟

گوتی: جەنابت باشتر دەزانی.

گوتم: وتارەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) یان قورئان بوون، ئەویدیکەش هەمووی قسەی خۆی بووە، کە فەرموویەتی، ئێمە تەنیا بۆ تام و خوێ جارجار وتارەکانمان ئایەت و فەرموودەیەکیان ئاوێتە دەکەین، بەڵام وتارەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) یان قورئان بوون، یان سوننەت بوون.

گوتی: وایە! گوتم: ئەوەی وای لەتۆ حاڵیی کردوە، ئەوە عەلمانییە عەلمانیی، ئەوانەی دەیانەوێ ئایینی خوا، ناوو ڕەنگ و تام و بۆنی نەمێنێ، لەنێو خەڵکدا، ئەگەرنا ئێمە بەقورئان و فەرموودەی پێغەمبەرەوە مرۆڤین.

ئایا: ئنجا موو بەموو پابەند بوون بە ڕێبازی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) یانی چی؟

ئێمە سوپاس بۆ خوا مسوڵمانین و، لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرین (صلی الله علیه وسلم)، بەڵام پێموایە کە لە خزمەت ڕێبازی پێغەمبەردابوون و موو بەموو پێوە پابەندبوونی، زیاتری دەوێ و پێویستە ئێمە زیاتر پێغەمبەری خوا بناسین و، پێش پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) باشتر لە قورئان تێبگەین، چونکە تاکە کتێب و بەرنامەیەك کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی بووە، قورئان بووە، پێویستە سەرەتا باش لە قورئان تێبگەین، ئنجا دواتر هەڵبدەین بزانین پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کێ بووەو، چۆن بووە؟ پێویستە هەرکام لە: بوونناسیی و، ئیمان و عەقیدە و،




عیبادەت و تەقوا و، ڕەوشت و، هەڵس و کەوت و هەڵوێستمان، وەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بێ.

مامۆستایانی بەڕێز!

بێگومان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وێڕای خواپەرستیی فەرز، هی سوننەت (مندوب)یشی هەبووە، وەك: نوێژە سوننەتەكان، بەتایبەت وەترو شەونوێژ، هەروەها ڕۆژی سوننەت، كە جۆری زۆرن بەتایبەت ڕۆژووی دووشەممەو پێنج شەممە، ئنجا زیكرەكانی بەیانیان و ئێواران و، كاتی ڕووداوو بۆنە جیاوازەكان و...هتد.

ئێمەش دەبێ بزانین ئێمە لەكوێی ئەوەین؟ هەڵبەتە ئەو یادی خوا كردن و، قورئان خوێندن و، شەو نوێژ كردن و، ڕۆژووگرتن و تاعەت و عیبادەتە، نابێ تەنیا تەماشای ڕواڵەتەكەی بكەین! یاخود بەس تەماشای چەندێتیی (كمیة)ەكەی بكەین، چونكە هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ) زۆر گرینگییانداوە بەچۆنیەتیی (كیفیة)و جۆر (نوعیة)و نێوەڕۆك (محتوی) ئەوەی ئێستا پێی دەڵێن: كوالێتی، زۆر گرنگییان پێداوە.

پێموایە ژمارەیەك لە مامۆستایان، لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە خەلەل و كەم و كوڕییان هەیە،ئنجا بێگومان ئیمان لە دڵدایەو كەس نایزانێ، (الإيمان سر، والإسلام علانية) بەڵام كە دەبینم مامۆستاو ئەهلی مینبەرو میحراب هەیە لەبەرانبەر ترسێكدا، یان بەهۆی تەماعێكەوە، چ ماددیی چ مەعنەویی، نەك هەر ڕێبازو كارو مەسلەكی خۆی فەرامۆش دەكات، بگرە هیچی بەسەر هیچەوە نامێنێ! دیارە ئیمانەكەی

پتەونیەو عیبادەتەکەی باش نیە، ئەگەرنا مسوڵمان چۆن دەبێ بەو دەردە بچێ! بەڵام ئیمان وتەقوایەکەی وانیە، باش بیپارێزێ و بیگرێتەوە.

هەڵبەتە (ئیمان و، عیبادەت و، تەقوا)ش دەبنە هۆی ئەوە کە مرۆڤ - مامۆستا و غەیری مامۆستا - هەم لەخزمەت خوادا بە خەسڵەتە بەرزو پەسندەکان (فضائل) برازێتەوەو، لە سیفەتە نزم و پەستەکان (رذائل) پاك بێتەوە، وەك ئەهلی تەزکیەو تەصەووف دەڵێن، هەم لەبواری مامەڵەو هەڵس وکەوت لەگەڵ خەڵکی دا، بەرەوشت و ئاکارە جوانەکان پڕنووربێ و، لەخوو و خدەی خراپ و ناشیرین و دزێو، بەدووربێ.





**٣- وریابوون لە ژمارەیەك هەڵەو پەڵەو لادان وخلیسکان:**

مامۆستا بەڕێزەکان!

وەك لەسەرەتاوە عەرزم کردن: منیش هەر یەکێکم لەخۆتان، بەڵام بەهەموو قەناعەتەوە دەڵێم: ئێمە دەبێ، لەو هەڵەو پەڵانەی باسیان دەکەم، وریابین، تاکو هەرچی زیاتر شایستەی ئەوە بین: پێمان بگوترێ: جێنشینی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و، شایستەی ئەو مینبەرە بین کە لەسەری دەوەستین و، ئەو میحڕابەی کە تێیدا ڕادەوەستین، هەرچەندە دەشزانم ژمارەیەکیشتان - ئەو مامۆستایانەی ئێستا لە خزمەتتاندام - لەسەر مینبەرەکان هێنراونەتە خوارو لەمیحڕابەکانیش خراونەدەر، با ئەم قسەیەشتان وەك قسەیەکی خۆش بۆبکەم، کە پەندی (إنَّ شرَّ البكيَّة مايُضحِكُ)ی بەسەردا دەچەسپێ: ڕۆژێك مۆستایەك گوتی: لە ئەوقافەوە تەلەفۆنیان بۆ کردم، گوتیان: تۆ لەمەودوا نوێژ ناکەی، (مەبەستیان ئەوەبوو، ناچی بۆ مزگەوتێ ئیمامەتیی بکەی)، منیش گوتم: لەکوێ نوێژێ نەکەم، لەماڵێش هەر نەیکەم؟ ئەوانیش گوتیان: نا نا لەماڵێ کەیفی خۆتە، لەمزگەوتێ مەیکە! ئنجا تەماشا بکەن: هەر فەرمانگەیەك و دامەزراوەیەك هەیە، دیفاع لە ئەندام و کارمەندانی خۆی دەکات، ئەوانەی ئینتیمایان هەیە بۆ ئەو دامەزراوە و دەزگایە، چەندی عەجایبە وەزارەتی ئەوقاف، یان ئەو دامەزراوانەی دیکە، دیفاع نەکەن لە ئەندامانی خۆیان، بەڵکو بەعەکسەوە گوێ لە مستی ئاسایش و ئەو دامەزراوە و دەزگایانەبێ، کە دام ودەزگای حیزبیین و، ئەسڵەن حکوومەتیان زەڕبی سفر کردوە،

وەزارەتەکە گوێ لەمستی ئاسایش بێ و، ئاسایش ئەو مامۆستایەی بەدڵ نیە، وەزارەت دەڵێ: مامۆستا مەچۆ مزگەوتەکەت، ئاسایش بەدڵی نیە! چۆن شتی وا دەبێ؟، بەخوا ئەوە زوڵمێکی گەورەیەو، ئەوە زوڵمەو نەك هەر لەو مامۆستایە دەکرێ! بەڵکو زوڵمێکی گەورەیە لە ئیسلام دەکرێ، زوڵمێکی گەورەیە لەم وڵاتە دەکرێ، زوڵمێکی گەورەیە لە نەوەی نوێمان و لە گەنجەکانمان دەکرێ، ئەو خەڵکە بەچی ماوەتەوە؟ ئەو خەڵکە بەو مامۆستایانە ماوەتەوە، ئەگەرنا زۆربەی دەبێتە نێرگەلەکێش و تلیاك کێش و، مەشرووب خۆر و،... هتد، ئەوکاتەش دەبێ هەموو دامودەزگای هەواڵگریی و ئاسایش و پۆلیسی ئەم وڵاتە، خەریکی چارەسەری ئەو کێشەو گرفتانە بن، کە ئەو گەنجانە پەیدای دەکەن، کە لە مزگەوت دوور دەخرێنەوە، لە ماڵی خوا دوور دەخرێنەوەو، تووشی بارِ و مەیخانە و، نێرگەلە کێشان و، شوێنی خراپیان دەکەن، چۆن دەبێ مامۆستایەك لەسەر مینبەر و میحڕابەکەی بهێنرێتە خوارەوە، هەر لەبەرئەوەی چوار قسەی حەقی کردوە، ئەدی ئەرکی مامۆستا ئەوە نیە کە قسەی حەق بکات؟!




## ئەو هەڵەو پەڵانەی دەبێ زۆریان لێ وریابین

### ١- لەبواری زانیاریی بە ئایین و ئاشنایی بە ژیندا:

#### أ- زانیاریی بە ئایین:

مامۆستایان! دەبێ بەردەوام خەریك بن، زانیاریی خۆیان زۆر بکەن لە هەموو بوارەکاندا، دەبێ بەردەوام خەریك بن کە شارەزایی خۆیان لە قورئان و سوننەت دا قووڵ بکەنەوە، بەپێی ئەو ڕۆژگارو کۆمەڵگایەی تێیدا دەژین، زۆرجار وێنەم بەوە هێناوەتەوە: (إبن تیمیة) حەنبەلیی مەزهەبە، (ئیمام ئەحمەد) خوا لێی خۆشبێ سەرمەزهەبی حەنبەلییە، کە مەزهەبیی حەنبەلیی لە هەموو مەزهەبەکانی دیکە، زیاتر بەلای دەقگەرایی دایەو، ئیجتیهادی کەم تێدایەو بەزۆریی دەقەکانی سوننەتی هێناون، کەچی (إبن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێبێ، کە زانایەکی گەورە بووە، نەچووە بە موسنەدی (ئیمام ئەحمەد) ئیکتیفا بکات، کە دەوری چل هەزار (٤٠,٠٠٠) دەقی سوننەتی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) تێدایە، بەڵکو هەڵساوە ئەو هەموو فەتوایانەی داون، کە لە سی و پێنج (٣٥) بەرگدا کۆکراون بەناوی: (مجموع الفتاوی)، ئنجا ئەوە مانای چییە؟ یانی: ڕۆژگارو زەمانی (إبن تیمیة)، ڕۆژگارو زەمانێکی دیکە بووەو، پێویستی بەوە کردوە خۆی دووبارە تەماشای قورئان و سوننەت بکاتەوە، چونکە تەنیا وەحیی کۆن نابێ، مەزهەب و بۆچوونەکان کۆن دەبن، پرسیارە تازەکان بە وەڵامە کۆنەکان، وەڵام نادرێنەوە، نەخۆشییە

تازەکان بە دەرمانی کۆن چارەسەر ناکرێن، دەبێ دووبارە بگەڕێینەوە بۆ قورئان و سوننەت، دووبارە بگەڕێینەوە بۆ وەحیی، مامۆستایان! زانایانی پێشوو (ڕەحمەتی خوایان لێبێ) بۆ ڕۆژگارو کۆمەڵگای خۆیان قسەیان کردوە، لەوبوارانەدا کە گۆڕانیان بەسەردا دێ، نالێم: لەهەموو شتێکدا، بواری بوونناسیی وتێروانین و، ئیمان و عەقیدە و، عیبادەت و تەقواو تەزکیە و، ئاکار و ڕەوشت و، حەڵاڵ و حەرام، جیایە، بەڵام بوارەکانی: هەڵس و کەوتەکانی سیاسیی و، ئابووریی و، کۆمەڵایەتیی و، جەنگ و ئاشتیی و،... هتد، پێویستییان بەوە هەیە کە ئێمە بەردەوام تەماشای وەحیی بکەینەوەو، هەر وەحیی بەکەڵکی هەموو کات و شوێنێك دێ.

ب- ئاشنایی بەژین:

مامۆستایانی بەڕێز!

ئێمە پێویستە لەخۆمان وریا بین، خەڵکی فێڵباز کڵاومان لەسەر نەنێ و سوودی خراپمان لێوەرنەگرێ و (إستغلال)مان نەکات، ئەوەندەم پەرۆشی مامۆستایەکە، کە ڕێزو حورمەتێك و کەسایەتییەکی هەیە، خەڵك خوا خوایەتی قسەی بۆ بکات، کەچی هەر هێندەت زانی حیزبێکی عەلمانیی دەستی گەیاندێ، خێری پێوە ناهێڵێ و، دەیکاتە پووش! حەیفە مامۆستا ئاگای لەخۆی نەبێ، هۆشیارو واقیع بین و سەرناس نەبێ، چۆن دەبێ فەرقی ڕەش و سپیی نەکات!، چۆن دەبێ فەرقی کەسێك نەکەی کە دەڵێ: ئەوە قورئان و سوننەت و ڕێی خوا و پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام)، بەڵام ئەوی دیکە بە کوێرە ڕێگاتدا دەبات؟! کەچی داماوی وایە دەڵێ: لایەنە سیاسییەکان جیاوازییان نیەو هەموویان وەك یەکن!!

**٢- لەبواری ئیمان و عەقیدەدا:**

بەڕێـــزان!

دەبێ لەبواری ئیمان و عەقیدەش دا، یەکجار لەخۆمان وریا بین، هەمووتان ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خواتان (صلى الله عليه وسلم)، نەك هەر نەبیستوە، بەڵکو چەندان جار بۆ خەڵکتان باس کردوە: کە مرۆڤ جاری وایە وشەیەك دەڵێ لە ڕەزامەندیی خوادا، وەك لە عەرزێوە پێی بچێتە سەر حەوت تەبەقەی ئاسمان، هێندە بەرز دەبێتەوە، بەپێچەوانەوەش: جاری واش هەیە وشەیەك دەڵێ، لە تووڕەیی خوادا وەك لەحەوت تەبەقەی ئاسمان بێتەوە عەرزێ، هێندە نزم دەبێتەوە[1].

لە ڕووی ئیمانیی و عەقیدەییەوە، دەبێ لەخۆمان وریا بین: پشتگیری کردنی غەیری ئیسلام زۆر خەتەرە، بەموتڵەقیی نابێ پشتگیری هیچ بیرۆکە و بەرنامەیەك بکەین، غەیری قورئان و سوننەت، غەیری ئیسلام، چونکە هەقی ڕەها تەنیا لەلایەن خواوە:

﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ ... ﴾ الكهف-٢٩- کە ئەویش لەوەحییەکەی دا بەرجەستەیەو، ئەویش لە قورئان و سوننەتدا کورت هەڵاتوە.

---

(١) [إن العبد يتكلم بالكلمة يزل بها في النار أبعد ما بين المشرق والمغرب] رواه أحمد: ٨٩٠٩، وصححه شعيب الأرنؤوط.

**٣- لەبواری پەرستشەکاندا:**

بەڕێــزان!

بەڕاستیی دەبێ لەو بوارەش دا خۆمان گورج و گۆڵ بکەینەوە، چ ئەگەر بمانەوێ خۆمان قایم وپتەوو دامەزراو بین، کە دەبێ وابین، چ ئەگەر بمانەوێ خەڵك فێری شەو نوێژو، ڕۆژووی سوننەت و، نوێژی سوننەت و، قورئان خوێندن و، زیکرو پاڕانەوە بکەین، هەڵبەتە بەبێ ئەو جۆرە عیبادەتانەش، ئینسان هێزێکی وای نابێ، لەبەرانبەر ئارەزووان وگومانان (شهوات وشبهات)دا خۆی ڕابگرێ.

جاروبار هەندێك زانیارییم پێدەگات، کە هەندێك مامۆستا لە خشتە دەبرێن و، هەندێك فێڵیان لێدەکرێ، تۆڕ (شبكة)ی خراپ هەن، دەیانەوێ ڕەمزەکانی ئیسلام بشێوێنن، دەیانەوێ مامۆستایانی مینبەر و میحراب ناشیرین بکەن، ئنجا یەکێك ناشیرین دەکەن بۆ ئەوەی سەدی دیکەی پێ ناشرین بکەن! دەبێ لەخۆمان وریا بین، بێگومان ئەوەی مرۆڤیش بەهێزو پێز دەکات و وادەکات خۆڕاگربێ، ئەو عیبادەتە تایبەتەیە کە بە شەوێ و لەوکاتە پەنهانەکان دا دەیکات، خوا کە باسی (عباد الرحمن) دەکات:

﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴿٦٤﴾ ﴾، الفرقان (٦٣-٦٤)

یەکێك لە توێژەروان دەڵێ: ئەوە خواپەرستیی شەوێیانە، ئەخلاقی ڕۆژێیان جوان دەکات، لەبەر ئەوەی شەوێ لەخزمەت خوادان، بۆیە بەڕۆژ لەکاتێکدا لەگەڵ نەفامان دا ڕووبەڕوو دەبنەوە، بەو شێوەیە ڕەووبەڕوو دەبنەوە، کە شایستەی بەندەکانی خوا بێت.

**٤- لەبواری ڕەوشت و ئاکاردا:**

ئەهلی مینبەرو میحراب پێویستە زۆر لەخۆیان وریا بن، جگە لە ڕاستگۆیی و ئازایەتیی و سەخاوەت و ڕەحم و بەزەیی و شەهامەت و جورئەت و ئەمانەت پارێزیی، هیچ شتێکی دیکەیان شایستە نیە، میراتگرانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، جێگرانی پێغەمبەر هەر ڕەوشتە بەرزەکانیان شایستەن، بێگومان کەسیش لەپڕ نابێت بەکوڕ، دەبێ لەگەڵ خۆماندا خەریك بین، لێرەدا وەك برایەکی دڵسۆزی خۆتان پێتان دەڵێم: با زۆر لە کەلەپووری ئەهلی تەزکیەو تەصەووف بەهرەمەند بین، بۆوێنە: هیچ کتێبێك وەك (إحياء علوم الدين)ی (غزالي) نەفسی مرۆڤ شی ناکاتەوە، ئەو (رذائل و فضائل)ەی ئەو باسیان دەکات، چۆن مرۆڤ عەیبەکانی خۆی ببینێ و چۆنیش چارەسەریان بکات؟ هەروەها حیکمەتەکانی (أحمد بن عطاء الله السكندري) کە بە (الحكم العطائية) ناسراوە، (مدارج السالكين)ی (إبن قيم الجوزية) و، (المكتوبات)ی (الإمام الربّاني)، دەبێ لێیان بەهرەمەند بین[1]، بەڵام بەداخەوە تەوژمێکی

---

(١) بەندەش چەند بەرهەمێکم هەن لەوبارەوە:

١- (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون) کە خەریکین چاپی شەشەمی دەکەینەوە.

وشکە سەلەفیی، لە وڵاتی ئێمەدا هەیە، هەستیارییەکی زۆری پەیداکردوە بەرانبەر بە کەلەپووری تەزکیە و تەصەووف! بەڵام وەك چۆن هەندێك لە زانایان، پسپۆڕ بوون لەهەڵهێنجانی حوکمە شەرعییەکان داو پێیان گوتراوە: (فُقَهاء)، هەندێك لە زانایانیشمان پسپۆڕبوون لە بورای تەزکیەی نەفسدا، کە ئەهلی تەصەووف و عیرفانیان پێ دەگوترێ، ئنجا وەك چۆن شەرعزانان (فُقَهاء) هەڵەو پەڵەیان هەبووە، ئەهلی تەزکیەو تەصەووفیش هەڵەو پەڵەیان هەبووە، بەڵام هیچ کەس باغێکی پڕ لە میوە ڕەفز ناکات، لەبەر ئەوەی چەند میوەیەکی کرچ و کاڵ یان گەنیوی پێوەن!

بەڵێ بەڕێزان!

بەبێ قوڵبوونەوە بەخۆداو، بە بێ تەزکیەی نەفس و کاری جیددیی لەسەر خۆکردن، ئێمە تواناو بڕستی بەرگریی و بەرهەڵستیی فشارە دەروونیی و دەرەکییەکانمان نابێ و، ناتوانین کە لەگەڵ خەڵك دا مامەڵە دەکەین، بە ئەدەبی بەرزو ڕەوشتی جوانەوە مامەڵە بکەین.

---

٢- (گیانی ژیان).

٣- (گەڕانەوە بۆ لای خوا) کە ئەمیش لەمێژە نوسخەکانی چاپی پێنجەمی نەماون.

٤- (خواپەرستیی، تەقوا، تەزکیە) کە یەکێکە لە کتێبەکانی مەوسووعەی: (بەرەو باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن) و لەژێر چاپە.

**٥- هەڵس و کەوتە کۆمەڵایەتییەکان:**

بەڕێـــزان!

لەوبارەوەش زۆر شت هەیە بگوترێ ئەگەر خۆپارێزیی (تحفّظ) نەکەین: مامۆستایان پێویستە زۆر لەخۆیان وریابن لە هەڵس و کەوتە کۆمەڵایەتییەکان دا، بۆوێنە: مامۆستا نابێ وا بێتە بەرچاو کە چاوی لەدەستی خەڵکە، هەروەها مامۆستا نابێ وا بێتە بەرچاو کە نەوسنە و چاوی لە پارووپەك نانە، پێموایە بایی ئەوەندە خەڵکی خاوەن عیززەت و، خەڵکی خاوەن دین و ماریفەت هەر هەیە، کە ڕێز لە مامۆستایان بگرێ و بەئاتاجیی تێیانەوە ڕانەمێنێ، بۆوێنە: هەندێ مامۆستامان هەن، لە مینبەرەکانیان هێنراونە خوار و، لە میحرابەکان دا ڕێیان پێ نادرێ، بەڵام بەخوا حورمەت و ڕێز و قەدریان لەلای خەڵك و جەماوەر چەندان هێندەی جاران زیاتر بووە، کەسانی دیکەش هەن، لەسەر مینبەران قیتیان کردوونەوەو، ڕەنگە بە ئاڕاستەکردن (توجیە)ی حیزبیی مزگەوتەکەشیان قەرەباڵغ بکەن، بەڵام لەلای خەڵك و جەماوەری بەویژدان و هۆشیار، سەنگ و ئیعتیبارییان نیە.

**٦- لەبواری بارودۆخی سیاسییدا:**

هەندێك لە مامۆستایان دەبینم: حاڵەتێکی سیاسیی دێتە پێش، تەماشا دەکەن: خەڵك چی دەوێ و حەزی لە چ قسەو هەڵوێستێکە، ئەوە دەردەبڕن! ڕۆژێك لە مەجلیسێك بووم، مامۆستایەك - ئەوکاتەی کە شەڕی ڕۆژئاوای کوردستان هەبوو - گوتی: ئەمڕۆ حەشرم کرد، وام کرد و وام گوت وخەڵکەکە زۆریان پێ خۆش بوو، گوتم: مامۆستا قیبلەنومای ئێمە لەقسەو وتارمان دا، نابێ ئەوە بێ داخۆ خەڵك چی پێ خۆشە؟ یان فەیس بوك چی پێخۆشە؟ دەبێ سەرنج بدەین: خوا (سبحانە وتعالی) چی پێخۆشە؟ بەڵێ گەلی کورد حەقی خۆیەتی خاوەنی ئیرادە و ئیدارەی خۆی بێ، بەڵام دەبێ کوردیش لەسەر پێی خۆی بوەستێ و پشت بەخوا ببەستێ.

بەڵام (کورد) هەر ڕۆژە کەسێك هەڵیخەڵەتێنێ و کڵاوی لەسەر بنێ، دەبێ پێش ئەم و ئەو، گلەیی لەخۆی بکات و مامۆستایانیش دەبێ وریابن چۆن قسە دەکەن! مامۆستایان نابێ لەژێر کاریگەریی فەیسبووك و، شەقام و، خەڵکدابن، دەبێ لەژێر کاریگەریی ئەو وەحیی و پەیامەدابن، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆی بەجێهێشتوون، دەبێ مامۆستایان خەڵك ئاراستە بکەن، نەك خەڵك مامۆستایان ئاراستە بکات، مامۆستا نابێ بڵێ: خەڵك وای پێخۆشە، با وا بڵێین! خۆ تۆ گوڵە بەڕۆژە نی، لەگەڵ ڕۆژێ بسووڕێی، تۆ دەبێ لەگەڵ وەحیی خوادا بسووڕێی، نەك لەگەڵ بازاڕی ڕۆژ!

**٧- لەبواری ژیان و گوزەران دا:**

دەزانم ژیانی مامۆستایان چۆنە، بەڵام بەڕاستی ئەم پەندە زۆر جوانە: (القناعة كَنْزٌ لا يَفْنى) واتە: قەناعەت خەزنەیەکە هەرگیز کۆتایی نایەت، بێگومان سادەیی و قەناعەتیش لە مامۆستایان زۆر جوانە، لە هەموو کەس جوانە، بەڵام لەمامۆستایان جوانترە، هەڵبەتە هەندێك کەسیش هەیە خوا ڕزقی بەسەردا دەڕێژێ، داوود و سولەیمان هەردووکیان حوکمڕان بوون و پێغەمبەریش بوون، بۆیە زانایان گوتوویانە: (ليس الزهد ألاّ تملك شيئًا، ولكنّ الزهد ألاّ يملكك شيء) واتە: زوهد ئەوەیە هیچ شتێك تۆی نەبێ، (تۆ نەبی بە کۆیلەی پارە و سامان و پۆست و مەقام)، نەك تۆ هیچت نەبێ، با زۆرت هەبێ، بەڵام لەلات کەم بێ و لەسەر حیسابی دین و ڕێزو حورمەتت نەبێ.

**٨- لەبواری زوڵم و مەزڵووم و زاڵمدا:**

هەمیشە مامۆستایان دەبێ لە ڕیزی مەزڵووماندا بن، هەرگیز ناگونجێ، مامۆستا لەگەڵ زاڵمێك دا بوەستێت، هەڵبەتە مسوڵمانان بەتێکڕا هەموو ئەوانەی کە خۆیان بە عایدی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەزانن، مامۆستا و غەیری مامۆستاش، دەبێ هەمیشە ئەهلی ئیمان وئیسلام لەگەڵ مەزڵووماندا بن، هەموو پێغەمبەرەکان (عليهم السلام) لەگەڵ مەزڵوومەکاندا بوون و، لەبەرانبەر زاڵمەکاندا وەستاون، چ زوڵمی نەتەوەییان کردبێ، چ زوڵمی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییان کردبێ، تەماشا بکەن شوێنکەوتووانی پێغەمبەران کێ بوون؟

﴿ فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِىَ ٱلرَّأْىِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍۭ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَـٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾ هود -٢٧-.

شوێنکەوتووانی پێغەمبەران خەڵکی سادە و هەژار، کەم دەست بوون کە حوکمڕانە خۆبەزلگرو خۆسەپێنەکان بە: (أراذِلُنا) کەم بایەخەکانمان، ناویان بردوون! بەڵام دوژمن وناحەزەکانیان بریتی بوون لە: (مُسْتَكْبِرِينَ) و (الْمُسْرِفِين) و (مُتْرَفِينَ)، خۆ بەزلگران و خۆسەپێنان و، زێدەڕۆییکاران و خۆشگوزەرانان، ئەوانە دوژمنانی پێغەمبەران بوون.

**٩- لەبواری تەبایی و هاوکاریی نێوخۆدا:**

ئەهلی مینبەرو میحراب، مامۆستایان لەنێوخۆدا، زۆر گرنگە تەبابن و، بۆیەکدی دڵسۆز و بەپەرۆش بن، مامۆستایەك کە هەڵەیەکی کردوە، دەبێ ئەوی دیکە یان ئەوانی دیکە بەلەباریی پێی بڵێن: مامۆستا! ئەوەت هەڵە بووە، دووبارەی مەکەوە، کە تاکو ڕاددەیەك ئەوە هەیە، بەڵام با ئەوە لەخۆماندا زیاد بکەین، بۆیەکدی دڵسۆزو بەخەم و بەپەرۆش بین، کەس نیە تووشی کەم و کوڕیی و هەڵە نەبێ، بەڵام دەبێ هەڵە بۆیەکدی ڕاست بکەینەوە، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (لا تَكونوا عَوْن للشَّيطان على أَخيكمْ)[1].

واتە: هاوکاری شەیتان مەبن لەدژی برایەکەتان.

---

(١) رواه البخاري: ٦٣٩٩.





**١٠- لەبواری لەسەرپێی خۆ وەستان و پشت بەخوابەستن دا:**

ئەگەر بمانەوێ ناوونیشانی جێگرایەتیی پێغەمبەرانمان شایستەبێ، دەبێ پشتمان بەخوا قایم بێ و تەنیا پشت بەخوا ببەستین و، لەسەر پێی خۆمان بوەستین، بۆ هەر کارێك کە دەیکەین و، چاومان لەم و لەو نەبێ، لێرەشدا پێویستە ئاگامان لێ بێ ساچاندن (مُداراة) و نەرمکێشیی (مُداهنة) تێکەڵ نەکەین، (مُداراة) ئەوەیە: کە زەخت لەخۆت بکەی، تاکو دینت سەلامەت بێ، یانی پشت لەبەرژەوەندییەکانت بکەی و دینت سەلامەتبێ، بەڵام (مُداهنة) ئەوەیە، زەخت لە دینت بکەی، تاکو بەرژەوەندییەکانت سەلامەت بن! دایکمان عائیشە ڕەزای خوای لێبآ دەگێڕیتەوەو دەڵێ:

(أَنَّ رَجُلًا اسْتَأْذَنَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا رَآهُ قَالَ: ( بِئْسَ أَخُو العَشِيرَةِ ، وَبِئْسَ ابْنُ العَشِيرَةِ)، فَلَمَّا جَلَسَ تَطَلَّقَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي وَجْهِهِ وَانْبَسَطَ إِلَيْهِ ، فَلَمَّا انْطَلَقَ الرَّجُلُ ، قَالَتْ لَهُ عَائِشَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، حِينَ رَأَيْتَ الرَّجُلَ قُلْتَ لَهُ كَذَا وَكَذَا، ثُمَّ تَطَلَّقْتَ فِي وَجْهِهِ وَانْبَسَطْتَ إِلَيْهِ؟، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا عَائِشَةُ، مَتَى عَهِدْتِنِي فَحَّاشًا، إِنَّ شَرَّ النَّاسِ عِنْدَ اللَّهِ مَنْزِلَةً يَوْمَ القِيَامَةِ مَنْ تَرَكَهُ النَّاسُ اتِّقَاءَ شَرِّهِ) .

رواه البخاري: (٦٠٣٢)، ومسلم: (٢٥٩١).

واتە: دایکی بڕوادارن عائیشە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە: پیاوێك مۆڵەتی لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خواست بێتە خزمەتی، ئەویش کە بینی فەرمووی: ئەمە خراپتر براو خراپترین کوڕی هۆزەکەیەتی.

ئنجا کاتێك دانیشت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵیدا ڕووگەش و قسە خۆش بوو، کاتێك پیاوەکە ڕۆیشت، عائیشە پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا کاتێك ئەو پیاوەت بینی، ئاواو ئاوات (لەبارەیەوە) فەرموو، کەچی کە دانیشت، لەگەڵیدا ڕووگەش و قسە خۆش بووی؟ پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:

ئەی عائیشە! کەی منت دیوە ڕەفتار دزێوو بێ ڕێزبم؟! بێگومان پێگە خراپترین کەس لەلای خوا لەڕۆژی قیامەت دا، کەسێکە خەڵکی لەبەر خراپییانی وازی لێ بێنن (خۆیانی لێ بپارێزن).

یانی: ئەو کابرایە زۆر خراپ بوو، بەڵام:

یەکەم: من ناگونجێ لەگەڵ هیچ کەس دا - بەتایبەت ئەگەر میوانم بێ- بێ ڕێزبم.

دووەم: ئەو ڕێز لێگرتن و ڕووخۆشییەم لەگەڵیدا، بەمەبەستی خۆپاراستن بوو لەخراپەو زیانی، ئەگەرنا شایستەی نەبوو.

پیاوی زۆر خراپ هاتۆتە ماڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و بەرلەوەی بێ، وەك خراپترین کەسی هۆزەکەی وەسفی کردوە، کاتێك هاتۆتە ژوورەوە، ڕێزی لێ گرتوە و قسەی نەرمی لەگەڵ کردوە، ئنجا ئەوە هەڵکردن (مُداراة)ە، کە فشار لەخۆت بکەی، تاکو دینت سەلامەتبێ و، لە پێناوی بەرژەوەندییەکانی دیندا، فشار لەخۆت بکەی، نەك لە پێناوی بەرژەوەندییەکانی خۆتدا، فشار لە دینت بکەی، کە ئەوە نەرمکێشیی (مداهنة) یە.

**١١- لەبواری تەنیا لەژێر بەیداغی ئیسلام دابوون دا:**

دوا قسەشم ئەوەیە: دەبێ هەمیشە هەوڵبدەین لەژێر بەیداغی ئیسلام دابین، لەسەر ڕاستە شەقامی خوا و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بین، ئەو ئایەتە موبارەکە بکەینە سەرمەشقمان، كە خوا (سبحانه وتعالی) دەفەرموێ:

﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾﴾ (الأنعام:٥٣)

واتە: ئا ئەمە ڕاستە شەقامی منە، دەجا شوێنی بکەون و بەدوای ڕێچکەکان مەکەون، ئەگەرنا دەترازێن لە ڕاستە شەقام (ی خوا)، (خوا) ئەم وەسیەتەتان بۆیە دەکات، تاکو تەقواتان پەیدابێ.

کەواتە: پارێزکار (مُتَّقي) کەسێکە تەنیا بەدوای ئیسلام بکەوێ، خۆ پارێز (مُتَّقي) ئەو کەسەیە کە تەنیا ڕاستە شەقامی خوا بگرێ، پێویستە سەلەفیی و، سۆفیی و، خەلەفیی و، خەڵکی ئیسلامیی و، هەموولایەك ئەوە بزانن: هەرکەس دەیەوێ، بە ئەهلی تەقوا لەقەڵەم بدرێ، با دڵنیابێ: تەنیا بەوە دەبێ بە ئەهلی تەقوا، کە لەسەر ڕێگای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)بێ، (عبدالله)ی کوڕی (مسعود)، لە ڕیوایەتێکدا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەم ئایەتەی خوێندەوە، ئنجا هێڵێکی ڕاستی کێشاو فەرمووی: (هذا صِراط الله) ئەمە ڕاستەڕێی

خوایە، دوایی چەند وردە هێڵێکی بەلای ڕاست و چەپدا کێشان و فەرمووی: (هَٰذه السُّبُل)، ئەمانەش ڕێچکەکانن، ئنجا فەرمووی: هەرکەسێك لەسەر ئەو ڕاستە شەقامە لایدا، تووشی یەکێك لەو کوێرە ڕێیانە دەبێ"[1].

ئنجا لە ئەهلی مینبەر و میحڕاب ناوەشێتەوە لەژێر بەیداغی (لا إله إلاّ الله)دا نەبن و، غەیری ئەو ڕێباز و بەرنامەیە هەڵبژێرن، کە پێغەمبەری خاتەم (محمد) (صلى الله عليه وسلم)، بە میرات بۆی بەجێهێشتوون.

خوا، بە لوتف و کەرەمی بێ سنووری خۆی، لێی دەپاڕێینەوە، بەناوە هەرە چاکەکانی و بە سیفەتە هەرە بەرزەکانی، کە یارمەتیی هەموو لایەکمان بدات، زیاتر لە قورئان تێبگەین و، باشتر بە ڕێ و شوێنی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، پابەند بین و، چاکتر بە ڕەوشتە بەرزەکانی خۆمان بڕازێنینەوە، خۆمان لەسیفەتە خراپەکان بژار بکەین، بۆئەوەی هەرچی زیاتر شایستەی مینبەر و میحڕابی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بین.



---

(١) رواه أحمد: ٤٤٣٧، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

# بەرهەمەکانی دانەر

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | أ / کتێبە کوردییەکان | | |
| | قورئان و سوننەت | | |
| ١ | پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤<br>چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| ٢ | با لە خزمەت قورئاندا بین، {کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟) و (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| ٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەکەم:سوورەتەکانی:(الفاتحة)و(البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سوورەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سوورەتی: (النساء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٦ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سوورەتی: (المائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سوورەتی: (الأنعام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم : سوورەتی: (الأعراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |



| | | | |
|---|---|---|---|
| ٩ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ١٠ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| ١١ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی نۆیەم: سوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٢ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دەیەم: سوورەتی: (هود) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یازدەیەم: سوورەتی: (یوسف) | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| ١٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دوازدەیەم: سوورەتەكانی: (الرعد، إبراهیم، الحجر) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٥ | شوێنكەوتنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لەنێوان كەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١٦ | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسە و گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| | بیروبڕواو فیكری ئیسلامیی | | |
| ١٧ | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچكان | چاپی یەك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| ١٨ | ڕێبـازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) كامەیە ؟! | چـاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو كتێبی (مسـوڵمانی كامڵ: بەشی یەكەم: بیروباوەڕی مسوڵمان) |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٩ | پڕۆژەی بەرنامەی پەروەردەو فێرکردنی ئیسلامییانە | چاپی یەك/١٩٩٥ | دواتر خرایە نێو کتێبی: (پڕۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی) |
| ٢٠ | پڕۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ٢١ | بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١ چاپی چوار/٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |
| ٢٢ | چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم، سەرنجێکی واقیعیانەو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢ چاپی شەش/٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و تورکیی و فارسییش |
| ٢٣ | خواناسیی، ئایین، ئیمان (درەوشاوەیی ئیسلام و پووچەڵیی ئیلحاد) | چاپی یەك/٢٠٠٢ چاپی سێ/٢٠٢٠ | |
| ٢٤ | ناوە هەرەجوانەکانی خوا "سبحانه وتعالى" | چاپی یەك ٢٠١٣/ | |
| مەوسووعەی : ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، (٦ بەرگ) | | | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ |
| ٢٥ | بەرگی یەکەم: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |
| ٢٦ | بەرگی دووەم: خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا | | |
| ٢٧ | بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناو و سیفەت و لەپەرستراوێتییدا | | |
| ٢٨ | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |

| ژ | ناونیشان | چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٢٩ | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر | | - |
| ٣٠ | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەكانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | | |
| ٣١ | مسـولمـانـی كامـڵ: بەشـی یەكەم: بیـروباوەڕی مسـولـمان | چاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو كتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسـلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا) |
| ٣٢ | تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەكانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨ چاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقــە لەهەفتەنـامەی (هـاووڵاتیی)و، ئەوەی دیكەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی(ئاوێنە)دا بڵاوكراوەتەوە |
| ٣٣ | ڕوونكردنەوەی بنەما شەرعییەكان و هێڵە گشتییەكانی كۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢ چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٣٤ | تەرجەمەی كوردیی عەقیدەی طەحاویی | چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ٣٥ | ڕوونكردنەوەی عەقیدەی طەحــاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| ٣٦ | سیكۆلاریزم و دیموكراسیی لە ئەزموونی كوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و، شێوەزاری كرمانجیی |
| ٣٧ | درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر ڕۆشنایی زگماك و عەقڵ و زانست و وەحییدا | چاپی یەك/٢٠١٩ چاپی دوو/٢٠٢٠ | |

| مەوسووعەی: بیركردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٨ | كتێبی یەكەم: پێناسەو چییەت و سەر گوزشتەو سەرچاوەكان و گرنگیی: بیركردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | - |
| ٣٩ | كتێبی دووەم: هێڵە گشتییەكانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠١٨ | - |
| ٤٠ | كتێبی سێیەم: تەوژمە سەرەكییەكانی مێژووی مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ٤١ | كتێبی چوارەم: پایەكانی بیركردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٩ | - |
| ٤٢ | كتێبی پێنجەم: چەند پرسێكی فیكریی هەنووكەیی جۆراوجۆر | چاپی یەك/٢٠١٩ | - |
| زنجیرەی: باچاكتر ئیسلام بناسین! | | | _ئەم سێ ئاڵقەیە: دوایی خرانە نێو مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە |
| ٤٣ | ئاڵقەی یەكەم: سەلماندنی بوونی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | - |
| ٤٤ | ئاڵقەی دووەم: پێغەمبەران "علیهم الصلاه والسلام" | چاپی یەك/١٩٨٩<br>چاپی دوو/١٩٩٠ | - |
| ٤٥ | ئاڵقەی سێیەم: ڕۆژی دوایی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٤٦ | ئاڵقەی چوارەم: ئایین | - | دوایی خرایە نێو كتێبی: (خواناسیی، ئایین، ئیمان) |
| ٤٧ | بیر و بڕوا | چاپی یەك/١٩٩٠ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| فیقهی ئیسلامیی | | | |
| | مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسـلامیی (٤ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٤٨ | بەرگی یەكەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەكان، پاك و خاوێنیی | | |
| ٤٩ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاكردن یەكەمین درووشمی خواپەرستیی | | |
| ٥٠ | بەرگی سێیەم: زەكات و ماڵ بەخشین | | |
| ٥١ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەج و عومرەكردن، زیكری خواكردن | | |
| ٥٢ | بنچینە گرنگەكانی هەڵسوكەوتی شەرعییانە و ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەكاندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە |
| ٥٣ | جەژن و یادو بۆنەكان و هەڵسەنگاندنێك | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٥٤ | چەند بابەتێكی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە كراوە |
| ٥٥ | چەند بنەمایەكی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| تەزكیەی نەفس و ڕەوشت و ئاكار | | | |
| ٥٦ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٥٧ | ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠ چاپی پێنج/٢٠١٢ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و فارسییش |
| ٥٨ | تەزکیەو تەبایی و، یەکڕیزیی و برایی | چاپی یەك/١٩٩٨ | |
| ٥٩ | مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |
| ٦٠ | گەڕانەوە بۆ لای خــوا (سبحانە وتعالی)، بەرەو خوا وەرچەرخان و، وازهێنان لە گوناهو سـەرپێچیی و، گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسـەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١ چاپی پێنج/٢٠١٠ | |
| ٦١ | شـەهید کێیەو چ پلـەوپایەیەکی هـەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |
| ٦٢ | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزنەوە، لەدنیاو دوارۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٦٣ | گیانی ژیــان: باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك کردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٦٤ | مەوســـووعەی: ڕەوشت و ئاکاری ئیســـلامیی لەبەر ڕۆشــنایی قورئان و ســوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٦٥ | ئەدەب و ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان لەبەر ڕۆشنایی وەحیی و عەقڵدا | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| | بانگـەوازو کاری ئیســـلامیی | | |
| ٦٦ | کۆمەڵـی خــوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٦٧ | پێشمەرگەی ئیســلام، یان مســوڵمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨ چاپی چوار/٢٠٢٠ | |

| ٦٨ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسـلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
|---|---|---|---|
| ٦٩ | بزووتنەوەی ئیسـلامیی لە دووڕیانی مان و نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٣ | |
| ٧٠ | بزووتنەوەی ئیسـلامیی و قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| ٧١ | تێگەیشتن | چاپی یەك/ ١٩٩٦ | |
| ٧٢ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسـلامییەكانی كوردسـتان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| ٧٣ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەكی گەش و ڕوون، بنەما شەرعییەكان و بنچینە ئەخلاقییەكان | چاپی یەك/ ١٩٩٧ | |
| ٧٤ | ئیســلام و كێشــە هەنووكەیی یەكان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٧٥ | زانایانی ئیســلام كێن و چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سـەر زمانی عـەرەبی |
| ٧٦ | كۆمەڵی ئیسـلامیی: ئامانج و هەڵوێسـتەكانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٧٧ | هەڵسوكەوت لەگەڵ خەڵكی دا و، چەند ئامۆژگارییەك بۆ ئەندام و موجاهیدانی كۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێڕراوەتە سـەر زمانی عـەرەبی |
| ٧٨ | چۆن لە جیهاد تێ بگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٧٩ | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سـەرنج و ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |

| ٨٠ | جیهاد لەڕێی خوادا/ بۆ ئەوەی بەهەڵە لەجیهاد تێنەگەین و لەسەر جەنگ کردنمان قەرزدار نەبینەوە | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
|---|---|---|---|
| ٨١ | جیهـاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەكرێ و چۆن دەكرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٨٢ | چەند ڕێـڕوونییـەك بۆ خوشـك و برایانمان لە هەنـدەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٨٣ | ئیسـلام و مسـوڵمانەتیی و كاری ئیسـلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |
| ٨٤ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |
| ٨٥ | بەشدارییكردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسـەنگاندنێكی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەكەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز كراوە، بەم شێوەیە: ئاڵقەی یەكەم: بەڵگەكانی ئەوانەی بەشدارییكردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان. ئاڵقەی دووەم : بەڵگەكانی ڕەوایی بەشدارییكردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |

| ٨٦ | هەڵوەشاندنەوەی بیـروڕاو ڕەفتارە پەڕگیـرانەكانی ڕێكخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٠ چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
|---|---|---|---|
| ٨٧ | با لادان و تاوانی پەڕگیران، بەرانبەر بە ئیسـلام نەمانخاتە دوودڵـیی و گومان | چاپـی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٨٨ | پەڕگیریی: پێناسەی، نیشانەكانی پەڕگیران، هۆكارەكانی پەڕگیریی، شـوێنەوارو دەرهاویشتەكانی، چارەسەری | چـاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| ٨٩ | هەڵسەنگاندنێكی كاری ئیسلامیی | چـاپی یەك/ ٢٠١٩ | |
| زنجیرەی بنەمـا شەرعییەكانی كۆمەڵی ئیسـلامیی | | | |
| ٩٠ | ئاڵقەی یەكەم: بەڵگە شەرعییەكانی بنیاتنانی كۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٩١ | ئاڵقەی دووەم و سـێیەم: حوكمی لادانی خەلیفەو كاربەدەسـتانی مسـوڵمان لەكاتی لاریی و ستەمكارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٩٢ | ئاڵقەی چـوارەم : شێخ ئەبوو بەصیرو هەڵسەنگاندنێكی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەكەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبیی |
| وتاری كۆنگرەكانی كۆمەڵی ئیسـلامیی كوردسـتان | | | |
| ٩٣ | كارو پرۆژەی ئیسـلامییمان (وتاری كۆنگرەی یەكەمی كۆمەڵی ئیسـلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥ چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٩٤ | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیكریی، سیاسیی كۆمەڵی ئیسلامیی كوردستان (وتاری كۆنگرەی دووەمی كۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| ٩٥ | چاوپێداگێڕانەوەیەكی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەكییمان (وتاری كۆنگرەی سێیەمی كۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| نەتەوایەتیی و مەسەلەی كورد | | | |
| ٩٦ | كوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ٩٧ | حوكمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠ چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ٩٨ | سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠ چاپی سێ/٢٠٠٥ چاپی چوار/٢٠١٨ | |
| ٩٩ | چارەسەری كێشەی كورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| ١٠٠ | حاڵەتی ئیسلامیی لە كوردستاندا | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ١٠١ | جەژنی قوربان و جەنگی قەڵاتووكان | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| سیاسەت و حوكمڕانیی | | | |
| ١٠٢ | چەند بابەتێكی سیاسیی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |

| ژ | بەرهەم | چاپ | |
|---|---|---|---|
| | مەوسـوعەی: ئیسـلام و دەوڵـەتداریی، (٤ بەرگ) | چاپی یەك / ٢٠١٤ | |
| ١٠٣ | بەرگی یەكەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەكانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت و بناغەی فیكریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| ١٠٤ | بەرگی دووەم: بنەمایەكانی سیستمی حوكمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ١٠٥ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەكان):<br>یاسادانان - جێبەجێكردن - دادوەریی | | |
| ١٠٦ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ١٠٧ | ڕوانینێكی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ١٠٨ | قورئان و پاكسازیی و چاكسازیی لە هەرێمی كوردستاندا | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٠٩ | گرنگیی ڕەوشت لەسیاسەتدا | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| | ئافرەت و خێزان | | |
| ١١٠ | ئافرەتی مسـوڵمانی كورد، مافە شەرعییەكانی و ئەركە گرنگەكانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣<br>چاپی دووەم / ٢٠٠٣ | |
| ١١١ | مەوسـوعەی : ئـافرەت و خێزان لە سـایەی شـەریعـەتدا | بەرگی یەكەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چـاپی سێ/٢٠١٣ | |
| | مـێـــژوو | | |
| ١١٢ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، دەرس و پەندەكانـی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |

| ١١٣ | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەكانم)، بەشی یەكەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
|---|---|---|---|
| ١١٤ | بەركوڵێكی كاروچالاكیی و ڕووداوەكانی ژیانم (١٩٦١-٢٠١٧) | چاپی یەك/٢٠١٨ | بۆ هەردوو زمانی عەرەبیی و ئینگلیزیی وەرگێردراوە |
| دیدارو گفت وگۆ | | | |
| ١١٥ | سنووره قەدەغەكان مەشكێنن! (چاوپێكەوتنی دكتۆرحسین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی دوو/٢٠٠٤ | - |
| ١١٦ | ئەشكەنجەو زیندان، پێشمەرگەیەك بیست و دوو مانگ لە زیندانی داگیركەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتەسەرزمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەیفارسیشی كراوەو چاپ و بڵاوكراوەتەوە،هەروەها بۆزمانیئینگلیزیش وەرگێڕراوەوچاوەڕێی چاپە |
| ١١٧ | گەنج لە چەمكە هەنووكەییەكاندا | چاپی یەك ٢٠١٠/ | |
| زنجیرەی بابەتە هەنووكەییەكان | | | |
| ١١٨ | گەنجەكانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی كردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١١٩ | با وریا بین ! داڕووخانی ڕەوشت كۆمەڵگاكەمان بەرەو هەڵدێر دەبات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |

| ١٢٠ | بەدوورخســـتنەوەی ئافرەت لە ئیســـلام چ زیانێـــك دەكەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | - |
|---|---|---|---|
| ١٢١ | چۆنیەتی بوونە پێشـەنگ و بنیاتنانی بنكەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٢٢ | سـیاسـەتی ئیسـلامیی و چەند ڕوونكردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٢٣ | چەند بنەمایەكی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٢٤ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سـەرنج و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٢٥ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سـەنگی مەحەكی مسـوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٢٦ | بانگەواز بۆ لای خودا چی یەو چۆنەو بە كێ دەكرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٢٧ | قوتابیان لەم هەل و مەرجەدا، پێویســـتە چۆن بن و چی بكەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٢٨ | واقیعی هەرێمی كوردسـتان ، دیدێكی ئیســـلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٢٩ | ســروشـت و پایەكانی خێزان و مەسـەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عـەقڵـــدا (١٢) | چـاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلكەیە بە(١٤) ئاڵقـە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە) دا بلاَوكراوەتەوە |
| ١٣٠ | كاری ئیسـلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەم ومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٣١ | حوكمی لە ئیســـلام هەڵگەڕانەوەو هەڵســـەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٣٢ | مەلای گەورەی كۆیەو تەفسیرەكەی و چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٣٣ | لێكۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٣٤ | تاقیكردنەوەی خوا بۆ بەندەكانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١٣٥ | ڕەووەندی كورد لە هەندەران و ئەركی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٣٦ | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێكی هەڵكەوتوو و هاوسەرێكی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٣٧ | گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆكار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١٣٨ | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەكان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |
| | ب/كتێبە عەرەبییەكان | | |
| | موسوعة : الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله | ط الاولى/٢٠١٥ | |
| ١٣٩ | كە لە چاپی یەكەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) كتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: | | |
| ١٤٠ | الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلق | ط الثانية/٢٠١٦ | |
| ١٤١ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط االثانية/٢٠١٧ | |

| ١٤٢ | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |
|---|---|---|---|
| ١٤٣ | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٤٤ | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٤٥ | الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٤٦ | الكتاب السابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوّته | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٤٧ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٤٨ | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٤٩ | الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى | ط الثانية/٢٠١٩ | |
| ١٥٠ | الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام | ط الثانية/٢٠٢٠ | |
| ١٥١ | الكتاب الثاني عشر: الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم | ط الثانية/٢٠٢٠ | |

| ١٥٢ | نقض فكـرة التطـرف | ط الاولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين) | |
|---|---|---|---|
| ١٥٣ | ضـيف و قضـية (مقابلة مع قنـاة العربية) | ط الاولى/٢٠٠٦ | - |
| ١٥٤ | لقاء خاص (مقابلـة مع قنـاة العـالم) | ط الاولى/٢٠٠٦ | |
| ١٥٥ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الاولى /٢٠١٦ | |
| ١٥٦ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الاولى/ ٢٠١٢ | |
| ١٥٧ | أمير وراء القضبان | ط الاولى/ ٢٠٠٩<br>ط الثاني/٢٠١٣ | |
| ١٥٨ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| ١٥٩ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الاولى/ ٢٠١١ | |
| ١٦٠ | علماء الإسلام: أوصافهم النّبيلة، وظائفهم الثقيلة، مواقفهم الجليلة | ط الاولى/ ٢٠٠٥<br>ط الثالثة/ ٢٠٢٠ | |
| ١٦١ | الأُصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/٢٠٠١<br>ط الثالثة/ ٢٠١٢ | |
| ١٦٢ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| ١٦٣ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الاولى والثانية/٢٠١٨ | |
| ١٦٤ | الديموقراطية والعلمانية في تجربة كوردستان | ط الأولى/ ٢٠١٧ | |

| ژ | ناونیشان | چاپ | |
|---|---|---|---|
| ١٦٥ | خلاصة أحداث حياتي ونشاطاتي الفكرية والسياسية (١٩٦١-٢٠١٧) | ط الأولى ٢٠١٨/ | |
| ١٦٦ | نظرات فاحصة في قضايا شاخصة: الإسلام والأمة، القضية الكوردية، الوضع العراقي | ط الأولى ٢٠١٨/ | |
| | ئەو کتێبانـەی لـەژێـر چاپـن | | |
| ١٦٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز/: تاکو سوورەتی: (الملك) خوا پشتیوان بێ کارکردن تێیدا بەردەوام دەبێ تا کۆتایی قورئان | | |
| | زنجیرەی: بەرەو باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن، کە لە: (١٢) کتێب پێکهاتوە: | | |
| ١٦٨ | بەرگی یەکەم: واقیعی دژواری ئوممەت: هۆکارو چارەسەر | | |
| ١٦٩ | بەرگی دووەم: هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی | | |
| ١٧٠ | بەرگی سێیەم: چۆنیەتی گۆڕینی کۆمەڵگا و پاکسازیی و چاکسازیی تێداکردنی | | |
| ١٧١ | بەرگی چوارەم: بەرەو بانگەوازێکی ڕاست و ڕەسەن | | |
| ١٧٢ | بەرگی پێنجەم: پایەکانی بووناسیی و، ڕوونکردنەوەی ئیمان | | |
| ١٧٣ | بەرگی شەشەم: خواپەرستیی، تەزکیە، تەقوا | | |
| ١٧٤ | بەرگی حەوتەم: بنەما گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | | |
| ١٧٥ | بەرگی هەشتەم: تایبەتمەندییە ئیمانیی و فیکرییەکانی جەماوەری مسوڵمانان | | |
| ١٧٦ | بەرگی نۆیەم: ڕەوشتبەرزیی دروشمی سەرەکیی جەماوەری مسوڵمانان | | |
| ١٧٧ | بەرگی دەیەم: چوار بابەتی سیاسی گرنگ و هەستیار | | |
| ١٧٨ | بەرگی یازدەیەم: بنچینە گرنگەکانی تەبایی و یەکڕیزیی مسوڵمانان | | |
| ١٧٩ | بەرگی دوازدەیەم: بنەڕەتەکانی مسوڵمانەتییەکی ڕاست و هاوسەنگ | | |

## کورتەیەك لە مێژووی ژیانی
## مامۆستا عەلی باپیر

ناو: عەلی باپیر وەتمان



لەدایکبووی: ساڵی (١٩٦١ز)دا لەقەزای پشدەر سەر بەپارێزگای سلێمانیی.

• زانیارییە ئیسلامییەکانی لە پەیمانگای ئیسلامیی (ڕانیەو سلێمانیی) و لە لای زانایانی کوردستانی عێراق و (دواتریش کوردستانی ئێران) بەدەستهێناون، لەساڵی (١٩٨٠ز)دا قورئانی بەپیرۆزی لەبەر کردوە.

• لەساڵی (١٩٨١ز)دا لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بڕیاری دەستگیرکردنی دراوە، هەربۆیە ئەوکات عێراقی جێهێشتوەو ئاوارەی ئێران بووە، کە ئەوکاتە لە قۆناغی دووەمی زانکۆ بووە، کۆلیجی شەریعەت.

• لەساڵی (١٩٨٣ز)دا گەڕاوەتەوە کوردستانی عێراق و لە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی هەولێر تاقیکردنەوەی ئیمامەتی داوەو، لە مزگەوتی (نۆڕسیی) لە شاری ڕانیە دامەزراوەو، بەردەوام بووە لەسەر دەرس گوتنەوەو بانگەوازی ئیسلامیی و...هتد.

• یەکەمین بەرهەمی لەساڵی: (١٩٨٣)زدا نووسیوە بەناوی: (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) پاشان کتێب و بەرهەمەکانی بەردەوام بوون کە ئێستا






ژمارەیان لەسەد (١٠٠) تێپەڕیوە، لە مەوسووعەو کتێب و نامیلکەو، بەزمانی کوردیی و عەرەبیی و، هەندێك لە کتێبەکانیشی کە بەزمانی کوردیی نووسیونی، بۆ زمانەکانی: عەرەبیی و، فارسیی و، تورکیی و، ئینگلیزییش وەرگێڕراون.

■ لەساڵی (١٩٨٧ز)دا پاش ساڵانێك لە خەباتی ئاشکراو نهێنیی پەیوەست لەگەڵ {بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی}دا، کە لەکۆتایی حەفتایەکانی سەدەی پێشوودا ڕێکخستنە نهێنییەکانی دامەزران، چۆتە چیاو دەستی بەخەباتی چەکداریی کردوە لە چوارچێوەی بزووتنەوەی ئیسلامییدا، کە لەچەند ناوچەیەکی کوردستاندا بنکەو بارەگای سەربازیی هەبوو دژی ڕژێمی بەعس و، هێزی حەمزەی لە بناری چیای قەندیل دامەزراند.

■ لە ساڵی (١٩٨٨ز)دا بووە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بزووتنەوەی ئیسلامیی.

■ لەساڵی (١٩٩١ز)دا ڕۆڵی هەبووە لەڕاپەڕینی ئازاری (١٩٩١ز) داو وریاکردنەوەی خەڵکی کوردستان، لە مەبەست و ئامانجەکانی ڕاپەڕینی جەماوەریی و ناساندنی بزووتنەوەی ئیسلامییدا.

■ تاکو ساڵی (٢٠٠١ز) لەنێو بزووتنەوەدا درێژەی بەخەباتی خۆی داوە، لەهەمان ساڵدا لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری هێزو مەڵبەندەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەبەر چەند هۆکارێکی مەنهەجیی (کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان) ڕاگەیانراو بەئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی هەڵبژێردرا.

- لە (٢٠٠٣/٧/١٠ز) لەسنووری سلێمانیی لەلایەن هێزەکانی ئەمەریکاوە بەتۆمەتی ناڕەوا دەستگیرکراو، بۆ ماوەی (٢٢) مانگ لەزینداندا مایەوەو، هەر لەزینداندا مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلي في كتاب الله)ی لە دوازدە کتێب و زیاتر لە چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕەدا نووسیی و، لە (٢٠٠٥/٤/٢٨ز)دا لەزیندان ڕزگاری بوو.

- تا ئێستا زیاتر لە (١٠٠) بەرهەمی هەیە لە: مەوسووعەو کتێب و نامیلکە، لەبوارەکانی: (فیکری ئیسلامیی و عەقیدەو فیقهو حوکم و سیاسەت و تەزکیەی نەفس و ئەخلاق و، بەرپەرچدانەوەی بیرو ڕێچکە نامۆیەکان و...هتددا.

- لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠١٠-٢٠١٤ز)دا، بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لەسەر بازنەی پارێزگای هەولێر کاندید بووەو، دەنگی یەکەمی هێناوە، زیاتر لە (٦٠،٠٠٠) دەنگ.

- کۆمەڵی ئیسلامیی تائێستا سێ کۆنگرەی بەستوە، لەساڵانی: (٢٠٠٥ و ٢٠١٠ و ٢٠١٥ز) داو، لەهەموویاندا، بەئەمیر هەڵبژێردراوەتەوە.

- ئێستا پرۆژەی تەفسیرکردنی قورئانی بەرزو بەپێزی دەستپێکردووەو، تا ئێستا چەند بەرگێکی لێ چاپ و بڵاوکراوەتەوە.

بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ژیانی دانەر، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:

www.alibapir.net

# نێوەڕۆك

# کێ شایستەی مینبەر و میحرابە؟

لەم کتێبەدا، هەوڵمانداوە پێناسەیەکی ڕوونو ڕاشکاوی ئەو کەسانە بکەین، کە شایستەیی نازناوی: میراتگرو جێگرانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)و، ئەهلی مینبەرو میحرابیان هەیە، ئەویش لە میانی، خستنە ڕووی گرنگترین خەسڵەتو هەڵوێستە بەرزو پەسندە بەمەرج گیراوەکان، لە هەرکەسێکدا، کە دەیەوێ بە شوێنکەوتووی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و، پارێزەری میراتەکەی دابنرێ.

شایانی باسیشە: ویستوومە ئەم کتێبەم ئاوێنەیەک بێ، وێڕای پێشاندانو ناساندنی زانایانی ڕەسەنو میراتگرانی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)، پەردەو دەمامکی سەر ڕووی کەسانی دیکەی، ساختەچیو موخەننەتو خۆ لەبەرگ و کەسایەتیی زانایانەوە پێچیش لابدات، تاکو خەڵکو جەماوەر بەهۆی ساختەو بوودەڵەکانەوە، لە ڕەسەنەکانیش نەکەوێتە گومانو لەبەرچاوی نەبێزرێن!







نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ۳۰مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com




